

کەسایەتیەك مێژوو ستەمی لێ کردووە

# سوڵتان عبدالحمیدی دووەم



نووسینی

محمد مصطفى الهلالي

وەرگێڕانی

کاروان ڕەشید محی الدین

مافی لە چاپدانی پارێزراوە بۆ
نارین

نـــــاوی کتێـــــب سوڵتان عبدالحمیدی دووەم

نووســـــــــــینی محمد مصطفى الهلالي

وەرگێڕانــــــــــی کاروان ڕەشید محی الدين

پێشەکی وپێداچوونەوەی ئەحمەد ڕەنجبار

تایـــــــــــپ ڕیاز محمود کاکە

هەڵەچـــــــــن عمر محمد

نەخشەسازی نـاوەوە کۆمپیوتەری نارین (محمد علی)

نـــۆرەو ســاڵی چــاپ یەکەم ٢٠١٢ز

ژمـــــارەی ســپاردن ژمارە سپاردنی (١١٤٠)ی ساڵی ٢٠١٠ی پێدراوە

بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی
website: www.nareenpub.com
E-mail: info@nareenpub.com
nareenpub@gmail.com
تەلەفۆن: ٢٥١١٩٨٢ ٦٦ (٠٠٩٦٤)
مۆبایل: ٠٠٩٦٤ ٧٥٠٤٠٦٤٦١٠

کەسایەتیەك مێژوو ستەمی لێ کردووە

# سوڵتان عبدالحمیدی دووەم

نووسینی

محمد مصطفى الهلالي

وەرگێڕانی

کاروان ڕەشید محی الدین

ناریـن

# پێشەکی

لەگەڵ دەست پێکردنی سەدەی چواردەیەمی زاینی هەتا هەردوو سەدەی پانزە و شانزەدا، عوسمانیەکان گەورەترین ئیمپراتۆریەتی ئیسلامیان دامەزراند کە لە بواری سەربازی و ئابووری و رامیاریدا زۆر پان و پۆڕ و بەهێز بوو، ئەم دەوڵەتە درێژ بوویەوە هەر لە ڤیەنناوە تا تەنگەڵانی (باب المندب) و وڵاتی قەوقاز لە ناو باکوری ئەفریقیاوە، بۆ کەناری دەریای ئەتڵەسی، ڕووبەری زەوی وڵاتەکە لە (٢٠) ملیۆن کیلۆمەتری چوارگۆشە تێپەڕی کرد بوو، ئەمەش بە هۆی جیهاد و نەبەردی سەرکردە و سوڵتانە مەزنەکانیانەوە کە بە هەستێکی باوەڕداری ڕاستەقینەوە حوکومڕانیان دەکرد و، وڵاتانی ئیسلامییان یەك خستەوەو، توانیان کۆمەڵێك شانشین و ویلایەتی ئەوروپا بخەنە سەر دەوڵەتی ئیسلامی، وەك: ڕزگارکردنی (قوستەنتینیە) کە هەموو عەرەب هەر لە سەردەمی موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانەوە هەوڵی ڕزگارکردنیان داوە! چونکە پێغەمبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) دەربارەی قوستەنتینیە فەرموویەتی: (لتفتحن القسطنطنية ولنعم الامير اميرها ولنعم الجيش ذلك الجيش) رواه احمد في مسنده واتە: قوستەنتینیە فەتح دەکرێت، ئەمیرەکەی باشترین ئەمیرە و سوپاکەشی باشترین سوپایە.

عوسمانیەکان لە سەرەتای جیهاد کردنیانەوە بەرەنگاری هێزە ڕۆژئاواییەکان بوونەوە کە دەیان ویست بەرەو وڵاتی ئیسلام مل بنێن! هەموو شانشینەکانی وڵاتی ئیسلامیان کردە سوپایەکی یەکگرتوو، بە تایبەت لە دۆڵی ئەنازۆڵەوە ڕووبەرووی بێزەنتینیەکان بوونەوە، ئەمەش دوای ئەوەی کە پایتەختی وڵاتەکەیان بووەو سەرئەنجام بەرەو ئەوروپا هێرشیان برد، دوای ئەوەی ئەوروپیەکانیش بەرەو وڵاتی ئیسلام ملیان نا و عوسمانیەکانیش توانیان ئیسپانیەکان لە وڵاتی ئەندەلوس و ڕووبارە ئیسلامیەکان وەدەر بنێن، بە تایبەت لە کەنارەکانی دەریای ناوەڕاست، تا سەرئەنجام ئەم دەریایە بوو بە دەریایەکی ئیسلامی، هەروەها بە سەر ڕووسەکاندا سەرکەوتن و دەستەڵاتی پورتوگالیەکانیان لە ڕۆژهەڵاتدا نەهێشت و سەرکەوتن بەسەر دوژمنان دا،ئیدی دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی ئیسلام لە نێو ئەو وڵاتانەی تازە خۆری ئیسلامیان پێ گەیشتبوو، ئیمپڕاتۆریەتی ئیسلامی هەر لە سەرەتای دروست بوونیەوە خۆی یەکلا کردبوویەوە بۆ بەهێز کردنی شەوکەتی ئیسلام و پاراستنی لە هەردوژمنێکی دەرەکی، نزیکەی شەش سەدە بەردەوام لە جەنگدا بوون دژی ڕۆژئاوا و لە هەوڵی ئەوەدا بوون کە حوکم ودادگەری ئیسلامی بگەیەننە بەشێکی زۆری ئەوروپا، خۆش بەختانە لەو هەنگاوەدا سەرکەوتوو

بوون و توانیان هێرشی ڕۆژئاوا بۆ سەر وڵاتی ئیسلام دوابخەن کە دواتر ڕۆژئاوا پی یَ هەستا.

ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە ڕوانگەی تورکە عوسمانیەکانەوە وەك ئیسلام خۆی سەیریان دەکردو، مێژوونووسەکان کە باسی وڵاتی عوسمانیەکانیان دەکرد، بە (دار الأسلام) ناویان بردووە و سوپاکەشیان بە سوپای ئیسلام ناوزەد کردووە،هەروەها سەرکردەکەشیان بە (شیخ الاسلام) ناو هێناوە، هەموو وڵاتەکانی خۆیان کە لەژێر دەستەڵاتی عوسمانیەکان دا بوون وەك موسڵمان وشوێن کەوتەی ئیسلام سەیریان کردوون، وشەی عوسمانی واتە: لە بنەڕەتدا دامەزرێنەرانی بۆ عوسمان ناوێك دەگەڕێتەوە، وەك چۆن عەباسیەکان و ئەمەویەکان ئاماژەیە بۆ ناوی خانەوادەی دەسەڵاتدار، وشەی عوسمانی هەرگیز کەس بە شێوازی نەتەوەپەرستی لێی تیَ نەگەشتووە، مەگەر دوای سەدەی نۆزدە ئەویش لە ژێر کاریگەری فیکرەی لیبڕاڵی ئەورووپیەوە وا ناوزەد دەکرا.

لە کۆتاییدا پێم خۆشە ئاماژە بەوە بدەم کە ئەم کتێبەم بەلاوە زۆر نایاب بوو، وە لە ساڵی (١٩٩٨) ەوە لەلای خۆم پاراستوومە! بەئومێدی ئەوەی ڕۆژێك وەربگێڕدرێت بۆ سەر زمانی شیرینی کوردی، دواجارو پاش یانزە ساڵ لەسەر داوای بەندە، برای بەڕێزم (م. کاروان

ڕەشید) لەماوەیەکی کەمدا وەری گێڕایە سەر زمانی کوردی، من دەست خۆشی لێ دەکەم و ئومێدەوارم پێنوسەکەی بەردەوام و کاریگەرتر بێت، بەئاڕاستەی خزمەت کردنی ئیسلام و موسڵمانان و مێژووی پرشنگداری ئیسلامیمان.

لەگەڵ ڕێزدا

ئەحمەد ڕەنجیار

هەڵەبجەی شەهید

## سوڵتان عبدالحمید و پێش گەیشتنی بە کورسی فەرمان ڕەوایی :

سوڵتان عبدالحمید کوڕی سوڵتان عبدالمجیدە، ناوبراو لە ڕۆژی چوار شەممە کە هاوکاتە بە (١٦) ی شەعبانی(١٢٥٨) ی کۆچی بەرامبەر بە (٢١) یان (٢٢) ی ئەیلولی (١٨٤٢) لە دایك بووە، شایانی باسە کە سوڵتان عبدالحمید، سی و چوارەمین سوڵتان و بیست و شەشەمین خەلیفەی دەوڵەتی عوسمانیە[1]، وە لە ڕێکەوتی (١٠) ی

(١) ژمارەی سوڵتان و دەسەڵاتدارانی عوسمانیەکان سی و حەوت سوڵتان و دەستەڵات دارە، کە یەکەمین سوڵتان عوسمانی یەکەمە، وە کۆتا سوڵان عبدالمجیدی کوڕی عبدالعزیزە، وە لە ساڵی ( ٦٩٩ ك – ١٣٤٣ ز ) بۆ ( ١٢٩٩ ك – ١٩٢٤) فەرمان ڕەواییان درێژەی کێشا، وە لە پاش سوڵتان عبدالحمید سێ سوڵتان و کاربەدەست فەرمان ڕەوایی وڵاتیان گرتە دەست کە ئەوانیش یەکێکیان برای بوو بە ناوی محمدی پێنجەم ناسراوە بە ( محمد الرشاد ) کە لە ساڵی (١٩٠٩) بۆ (١٩١٨) فەرمان ڕەوایی وڵاتی کرد، پاشان محمدی شەشەم ( وحید الدین ) کە لە ساڵی (١٩١٨ ) بۆ (١٩٢٢) لە کورسی فەرمان ڕەوایی دا بوو، پاشان کوڕە مامەکەی ( عبدالمجید ) کە تەنها پلەی خەلیفایەتی پێی سپێردرا بوو لە ساڵی (١٩٢٢) بۆ (١٩٢٣) فەرمان ڕەوایی وڵاتی لە ئەستۆدا بوو، وە هەر لەسەردەمی ( عبدالمجید) دا ئەتاتورك دامەزراندنی کۆماری تورکیای ڕاگەیاند کە ڕێکەوتی (٢٩) ی تشرینی یەکەمی (١٩٢٣) بوو، وە لە ڕێکەوتی (٣) ی مارسی (١٩٢٤) دا کۆتایی بە دەستەڵاتی خەلافەتی ئیسلامی هێنرا و، سەر ئەنجام سوڵتان عبدالمجید وڵاتی بە جێی هێشت، وە لە (٢٠) ی نیسانی (١٩٢٤) دا ئەتاتورك بە سیستەمی عەلمانیەوە جڵەوی فەرمان ڕەوایی کۆماری لە تورکیادا گرتە دەست .

شـوباتی (١٩١٨) کۆچـی دوایـی کـرد، مـاوەی فـەرمان ڕەواییەکەشـی (٣٢) ساڵ و (٥) مانگ و (٢٦) ڕۆژ بوو.

دایکی سـوڵتان عبدالحمید نـاوی (حـاجی) یـە، دایکـی لـە تـەمـەنی نۆزدە ساڵیدا بوو کە خوای گەورە سوڵتان عبدالحمیـدی پـێ بەخـشی، پێویـستە ئامـاژە بـەوە بـدەین سـوڵتان عبدالحمیـد زۆر بـە خێرایـی گەشـەی دەکـرد، بـە شـێوازێك گەشـەی جەسـتەیی و فـسیۆلۆژی لـە هـەموان خێراتـر بـوو، دایکـی بـەردەوام لـە هـەوڵی پـەروەردەکردنی کۆرپەکەی دا بوو، بە شێوەیەك تەنانەت یـەك ڕۆژیـش لـە پـەروەردەی دەروونـی و ڕەوشـتی عبدالحمیـد بـێ ئاگـا نـەبوو، هـەروەها لـە ڕووی ڕەوشـت و زمـان پاراوییـەوە سـوڵتان زۆر خێـرا گەشـەی کـردو پـێ گەیشت!! بە ئەندازەیەك هەمووانی دووچاری سەرسـامی کردبوو، لـە تەمەنی چـوار سـاڵیدا کەسـایەتیەکی سـەربەخۆی ئـەوتۆی لێ دروسـت بـوو، زۆر جـار بـە ئاڕاسـتەکردنی پرسـیار گـەلی زۆر گـرنگ هـەموانی دوچاری شۆك دەکرد، کە ئەمە بەڵگـە بـوو لـە سـەر زیرەکـی و زرنگـی سوڵتان عبدالحمید و هەر لە تەمەنی منداڵیەوە دەوروبەرەکـەی دەیـان زانـی کـە ئاینـدەی سـوڵتان ئایندەیـەکی گـەش و جێگـای ئومێـدی موسڵمانانە،چـونکە حیکمـەت و ژیـری و سـەلیقەکەی لـەو بـارەوە

باشترین شاهێد بوون! بەردەوام بە چاوی وریاییەوە سەیری دەورو بەری دەکرد، وە لە چاوەکانیدا نهێنیەك بەدی دەکرا کە سوڵتان دوو چاوی گەورەی سەوزی هەبوو، بەڵام لە بەر ئەوەی هێشتا توانای قسەکردنی زۆر باش نەبوو، هەروەها مێشك و بیرکردنەوەشی تەواو کامڵ نەبوو بوو، تا توانای وەرگرتنی ئەو سروشت و وتە جوانانەی دەوروبەری هەبێت و، هەست بە جوانیەکانی گەردوون بکات، کە خوای گەورە بەدەستەڵاتی خۆی دروستی کردوون ونەخشەی بۆکێشاون، هەمان کات دایکی زۆر بە جوانی هەستی بە زیرەکی و وریایی جگەر گۆشەکەی کرد بوو، هەرگیزای هەرگیز لە سەر ترس و ڕق لێبوون و تۆڵەسەندن پەروەردەی نەدەکرد، بەڵکو لە سەر خۆشەویستی پەروەردەی دەکرد بەو ئومێدەی کە منداڵەکەی بەرهەمێکی باش پێشکەش بە ئیسلام و موسڵمانان بکات، هەروەك لەمەو دواش ئاماژەی پێ دەدەین، سوڵتان عبدالحمید لەمێژووی ئیسلامیدا خزمەتێکی ئەوتۆی بۆ خۆی تۆمار کردووە کە هەرگیز لە بیر ناکرێت و تەنها خوای پەروەردگار دەتوانێت لە جیاتی ئیسلام و مسوڵمانان پاداشتی بداتەوە.

کاتێك سوڵتان عبدالحمید تەمەنی گەیشتە سەروو شەش ساڵ‌و، لە ساڵی (١٨٤٩)دا دایکی کۆچی دوایی کرد، کە ئەو کات دایکی تەمەنی بیست و شەش ساڵ بوو کە کۆچی دوایی کرد.

لە تەمەنی هەشت ساڵیدا درایە دەست مامۆستایەك تا فێری نوسین‌و خوێندنەوەی بکات، پاشان قورئانی پیرۆز و زۆرێك لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوای(صلی الله علیه وسلم) لە بەرکرد، وە هەروەها بەشێك لە شیعری کۆن (قدیم) ی لە بەر کرد، وە ڕێگاکانی فێربوونی زانستەکان بریتی بوون لە نوسین پاشان خوێندنەوە و دواتر لەبەری دەکردن.

پێویستە ئاماژە بەوەش بدەین کە سولتان عبدالحمید هاوشێوەی خەلیفەی عوسمانیەکان توانای ئەوەی هەبوو بە چەند زمانێك قسە بکات، زۆر بە جوانی دەیتوانی بە زمانی قورئان قسە بکات، هەروەها شارەزایی لە زمانی فارسی (شیعر – ئەدەب) دا هەبوو، دەیتوانی بە فارسی قسە بکات، وە زمانی تورکیشی دەزانی وەکو زمانێکی پێویستی ژیانی ڕۆژانە سەیری دەکرد، هاوکات زمانی ئەڵمانی و فەڕەنسی و ئینگلیزی و ڕوسیشی دەزانی.

هەروەها سوڵتان عبدالحمیدی دووەم، بەهرەی شیعریشی پێدرابوو حەزی لە شیعر نووسین دەکرد، کچەکەی کە ناوی عائیشەیە هەندێك لە شیعرەکانی باوکی بڵاوکردەوە لە کتێبەکەی دا بە ناوی (ابی عبدالحمید) ئەمەش بەشێکە لەو شیعرەی سوڵتان عبدالحمید، کەتیایدا لە خوای گەورە دەپاڕێتەوە، لەو کاتەدا کە موئامەرەچیەکان دێنە کۆشکەکەیی و سەرئەنجام کۆتایی بە دەستەڵاتەکەی دەهێنن:

یا إلهی اني اعرف انك عزیز.... ولیس احد سواك

انك واحد ولیس سواك

یا الهی خذ بیدي في هذه المحنة

یا إلهي کن عوني في هذه الساعات الحاسمة

بێگومان سوڵتان عبدالحمید زۆر ڕقی لە ڕۆژئاواییەکان دەبوویەوە، بە تایبەت کاتێك پلانی ڕۆژئاواییەکانی بۆ ئاشکرا بوو سەبارەت بە دابەش کردنی ناوچەکانی ژێر دەستەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی، کە ئەمەش ئاماژەیەکی ئاشکرا بوو سەبارەت بە ڕق و قین و ئاژاوەگێڕی ڕۆژئاوا بەرامبەر بە ئیسلام و مسوڵمانان و خەلافەتی ئیسلامی.

**بۆچی سوڵتان ڕۆشنبیری و زمانە جیاوازەکانی ڕۆژئاوای خۆش نەدەویست، ئەمە لە کاتێکدایە زۆر بە جوانی دەیتوانی بە زمانە جیاوازەکانی ڕۆژئاوا قسە بکات، سوڵتان عبدالحمید حەزی دەکرد بە زمانی دایك قسە بکات وهەمان کات شارەزایی لەو هەموو زمانەشدا هەبوو[٢].**

(٢) سوڵتان عبدالحمید لە لایەن دوژمنەکانیەوە تۆمەتبار دەکرا بەوەی کە کەسێکی نەزان و نەخوێندەوارە و توانای نوسین و خوێندنەوەی نیە، ئەمیش بۆ دەرخستنی ڕاستیەکان وسەلماندنی ئاستی شارەزایی خۆی بڕیاریدا خۆی فێری چەند زمانێکی بیانی بکات، لە سەر دەستی مامۆستا ( عومەر ئەفەندی ) فێری زمانی تورکی بوو، وە مامۆستا ( عەلی مەحوی ئەفەندی ) سوڵتانی فێری زمانی فارسی کرد، وە فێری زمانی عەرەبی و زانستەکانی تر بووە لە سەر دەستی مامۆستایان ( فاکا نویس لوتفی ئەفەندی )، هەروەها لە سەر دەستی ( ئەدهەم پاشا ) و ( کەمال پاشا ) فێری زمانی فەڕەنسی بووە، هەروەها مامۆستا ( کارت) ی فەڕەنسیش یارمەتی داوە بۆ فێر بوونی زمانی فەڕەنسی، بە هەمان شێوە وانەی مۆسیقاشی لە سەر دەستی دوو مامۆستای ئیتاڵی خوێندووە بە ناوەکانی ( کواتللی ) و ( لومباردی )، ئەمەش بووە هۆکاری ئەوەی کە سوڵتان عبدالحمید زۆر زیاتر حەز لە مۆسیقای ڕۆژئاوایی بکات، هەروەها زۆر هۆگر بووە بە خوێندنەوەی مێژوو، جارجاریش خولیای شیعر نووسینی هەبووە، جارێك چەند دێڕە شیعرێکی خۆی ناردبوو، بۆ مامۆستاکەی ( لوتفی ئەفەندی ) کە تیایدا پیرۆز بایی ئاڕاستە کرد بوو، سەبارەت بە ڕزگار بوونی لەو نەخۆشیەی کە ماوەیەکی دووروودرێژ گیرۆدەی بوو بوو .

سولْتان عبدالحميد کەسايەتييەکی ژير و بە تواناو لە سەرخۆ بوو،بەردەوام لە ژيانی دا يەکێك بوو لەو کەسايەتيانەی متمانەی زۆری بەخۆی هەبوو، کەسێکی ورياو زرنگ بوو هەرگيز بە قسەی باق و بريقی فێڵبازان فريوی نەدەخوارد، هەروەها کەسێکی ئەوتۆ بوو کە مرۆڤ لێيەوە فێری خۆشەويستی و ڕێز و گەورەيی دەبوو، لە هەموو ڕوانگەيەکەوە بە کەسێکی دەست و داوێن پاك دەهاتە پێش چاو، هەرگيز چاوی نەبڕيوەتە شەرەف يان سەروەت و سامانی خەڵکی‌و، هەمان کات زۆر بەخشندە و لێبوردە و هێمن و لە سەرخۆ بوو.

سولْتان عبدالحميد کەسێکی زۆر زيرەك بووە، تەنانەت زيرەکيەکەی لە ئاستێکدا بووە، کە توانيويەتی شارە زاييەکی زۆر لە زمانی فەڕەنسی دا پەيدا بکات، ئەمەش لە پاش ئەوەی کە لە تەمەنی شانزە ساڵيدا کەمێك شارەزايی لە زمانی فەڕەنسی دا پەيدا کرد، ئەويش لە ڕێگەی گوێ گرتنی لەو مامۆستايەی کە وانەی فەڕەنسی بە يەکێك لە خوشکەکانی سولْتان دەوتەوە!!

سولْتان عبدالحميد خاوەنی بيرو هۆشێکی زۆر ڕەوان بووە، بە بەردەوامی بيرتيژی سولْتان عبدالحميد ئەو کەسانەی دووچاری سەرسوڕمان کردبوو کە سەردانيان کردووە، بە شێوازێك توانای ئەوەی هەبوو فەرموودەيەکی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وەك

خۆی بخوێنێتەوە، ئەمەش لە دوای بیستنی ئەو فەرموودەیە بە چەند ساڵێك، بە بێ ئەوەی هیچ جۆرە هەڵەیەك لە خوێندنەوەی فەرموودەکەدا بکات، دیارە مەبەستمان لە خوێندنەوە، واتەوشە بە وشەی فەرموودەکەی لە بەر بوە بە مەتن و سەنەدیشەوە.

سیفەتێکی تری سەرسوڕهێنەرانەی سولّتان عبدالحمید ئەوە بوو، کەبە شێوەیەکی سەرسوڕ هێنەر ناو نیشانی زۆرێك لەو کەسایەتیە سیاسیانە لە مێشکی دا تۆمار دەبوو، تەنانەت ئەگەر ماوەی یەکتر بینینەکەشیان زۆر کورت بوایە، وە گوێی لە هەر وشەیەك ببوایە دەست بە جێ لە بەری دەکرد بە ئەندازەیەك دەورووبەرەکەی وا گومانیان دەبرد، لە سەر لاپەڕە نوسیویەتی و دەیخوێنێتەوە[٣].

سولّتان عبدالحمید هاوڕێیەتی (سولّتان عبد العزیزی) مامەی کرد لە کاتی ئەنجامدانی گەشتەکەیدا بۆ ئەسکەندەریە و قاهیرە لە ساڵی (١٨٦٣) دا، کە ئەو کات سولّتان عبدالحمید تەمەنی بیست و یەك ساڵان بوو، پاشان و بۆ جاری دووەم هاوڕێیەتی مامەی کرد لە گەشتەکەیدا بۆ پاریس و لەندەن کە ئەم گەشتەی لە هاوینی (١٨٦٧)دا ئەنجام دا.

---

(٣) دکتۆر (ماوتلن) کتێبی (عبدالحميد ظل الله على الأرض) ل ٥٠ .

سوڵتان عبدالحمید لە پاش گەڕانەوەی لە ئەوروپا، زیاتر حەزی لە زانست و زانیاری و فێربوونی زانستەکان دەکرد، خولیای ئەوە بوو کە شارەزایی و پسپۆڕی پەیدا بکات لە لقەکانی جوگرافیا و مێژوودا، هەروەها حەزی دەکرد لە نەخشەی وڵات و شوێنەکاندا شارەزایی پەیدا بکات، وە کۆمەڵە وێنەیەکی جوان و سەرسوڕهێنەری لە لای خۆی کۆکردبوویەوە.

## سوڵتان عبدالحمید له ژیانیدا كۆمەڵێك خولیا و هیوا و حەزی هەبووە وەك:

### كۆكردنەوەی هەموو جۆرە چەكێكی جیاواز و مەشقكردن لە سەر نیشانە شكاندن (ڕەمی)

بێگومان لەم حەزەیدا سەركەوتنی بە دەست هێنا، چونكە سوڵتان لە قۆناغی تەمەنی لاویەتیدا بەوە ناوبانگی دەركرد بوو، كە كەسێكی لێزان بووە لە بواری بەكارهێنانی شمشێر و ڕم بازی و سوار چاكی دا، هەروەها لە وەرزشی جەستەییدا سەركەوتنی بە دەست هێناوەو، هەمان كات پاش خۆی كۆمەڵە چەكێكی دێرین و جیاواز كە لە ناو مۆزەخانەیەكی بچوكدا لە یەكێك لە كۆشكەكانی دا بوون دۆزراونەتەوە.

### سوڵتان عبدالحمید حەز و خولیاكانی زۆر و جۆراوجۆر بوون لەوانەش :

#### ١- گفتوگۆ و وتووێژی سوڵتان لە گەڵ زانایان و شارەزایاندا:

زۆر جار لە كۆشكەكەیدا لە گەڵ زانایاندا كۆدەبویەوە و گفتوگۆو موناقەشەی لە گەڵ دەكردن، بە تایبەت لە مانگی پیرۆزی ڕەمەزاندا زیاتر گرنگی بەم كۆبوونەوەو وتووێژانە دەدا، بە هەمان شێوە لە تەكیەی (شێخ ظاهری شاذلی) دا لەگەڵ زانایاندا كۆدەبوویەوە، بە شانازییەوە گوێ ی شل دەكرد بۆ پێشنیار و بۆچوون و ڕەخنەو

ئامۆژگاریەکانیان، سولتان عبدالحمید زۆر بەم کۆبوونەوانە خۆش حاڵ دەبوو، هەمان کات سودی زۆریشی لە ئامۆژگاری و پێشنیارەکانی زانایانی ئیسلامی وەردەگرت کە لەو کۆبوونەوانەدا ئاراستەی دەکران.

**٢- کۆکردنەوەی کتێب :**

سولتان عبدالحمید ڕێژەیەکی زۆر کتێبی گرنگ و دەگمەنی کۆکردبویەوە، بگرە هەر بەوەندەش وازی نەدەهێنا، بەڵکو هەوڵی دەدا زۆرترین ژمارە لەو کتێبە دەگمەنانە وەدەست بخات، هەروەها زۆر لە دووی کتێبە دەست نووسەکان (مخطوطات) دەگەڕا، وە زۆر هانی ئەو کەسانەی دەدا کە بە شوێن کتێبە دەست نوسەکاندا دەگەڕێن، وەك هاندانیشیان لەسەر ئەو کارەیان خاوەنی کتێبەکان لە لایەن سولتان عبدالحمیدەوە ڕێزیان لێ دەگیراو پاداشت دەکران، چونکە سولتان زۆر بە تەنگ لە ناو نەچوونی کتێبە ئیسلامیەکان و بە تایبەت دەست نووسەکانەوە بوو، وەك سامانێکی گەورە و بەنرخی مێژووی ئیسلامی سەیری دەکردن، ژمارەی ئەو کتێبە دەست نووسانەی لە لای سولتان عبدالحمید بوون دەگەیشتنە (٦٤١٦٢) کە هەموویان بەرگیان تێ گیرا بوو، وە سەرجەمیشیان ئیسلامی بوون، شایانی باسە ئەم کتێبانە لە (٤٥) گەنجینەدا پارێزراو بون.

### ٣- دارتاشی :

سوڵتانەکانی دەوڵەتی عوسمانی عادەتیان وەهابوو، منداڵەکانیان فێری ئەو پیشەیە دەکرد کە خۆیان حەزیان لێ ی بوو، ئەمەش بۆ ئەوەی هەتا منداڵەکانیان لە پاشە ڕۆژدا بۆ ژیانی خۆیان سوود لەو پیشەیە وەربگرن، ئەگەر پێویستی کرد، بە هەمان شێوەش سوڵتان عبدالحمید وەك ئارەزو و هیوایەتێك پیشەی دارتاشی هەڵبژارد! لە ماوەی تەمەنی لاویەتیدا خۆی بە فێربوونی ئەم پیشەیەوە خەریك کرد، تا ئەوە بوو سەرکەوتنی بە دەست هێناو سەرئەنجام، بوویە وەستایەکی کارامە و شارەزای بواری دارتاشی، وە لە کۆشکەکەیدا کارگەیەکی دارتاشی دروست کرد، هەندێك لە کاتی خۆی تەرخان کردبوو بۆ ئیش کردن لەم کارگەیەدا..!.

پێویستە ئاماژەش بەوە بدەین کە سوڵتان عبدالحمید، هەرکات کۆشکەکەی بە جێ دەهێشت و دەهاتە دەرەوە، جانتایەکی دەگرت بە دەستیەوە، هەر کەسێك داوای ئەو جانتایەی لێ بکردایە بە مەبەستی هاوکاری کردنی و هەڵگرتنی، ئەوا سوڵتان داواکەی بەرپەرچ دەدایەوەو، رازی نەدەبوو کەس جانتاکەی بۆ هەڵبگرێت، دواتر و پاش

مردنی دەرکەوت کە جانتاکەی نهێنی تێدایە؟ لە بەر ئەوە بوو کە ڕازی نەدەبوو کەس بۆی هەڵبگرێت، نهێنیەکانیش بریتی بوون لە :-

أ - وەسیەت نامەکەی خۆی لە ناو ئەو جانتایەدا بوو.

ب - هەندێك پارە و پولی تایبەت لە ناو ئەو جانتایەدا بوو، کە ئەم پارەیەی بە ئارەقی ناوچاوانی خۆیی و لە پیشەی دارتاشیدا پەیدای کرد بوو، واتە ئەم بڕە پارەیەش کە کۆی کردبوویەوە هیچ پەیوەندی بە بەیتولمالی مسوڵمانانەوە نەبوو، بەڵکو خۆی پەیدای کردبوو، بۆ مەسروفی کفن و دفنی هەڵی گرتبوو!

### ٤-چاك کردنەوەی کاتژمێر و پیشەی گلسازی :

سوڵتان خۆی هەڵدەستا بە چاك کردنەوەی کاتژمێر، هەروەها لە ناو کۆشکەکەیدا کارگەیەکی هەبوو، تایبەت بوو بە دروست کردنی (گۆزە و دیزە) و پیشەی گلسازی، شایانی باسە سولْتان کاتە فەراغەکانی خۆی لەکۆشکەکەیدا بەم پیشەیەوە بەسەر دەبرد، هەروەك لە مزگەوتی (یەلدن) دا پاشماوەیەکی جوانی ئەم پیشەیە بەرچاو دەکەوێت.

### ٥-هونەرە جوانەکان (الفنون الجميلة ):

سولْتان عبدالحميد بەشێکی کۆشکەکەی تەرخان کردبوو بۆ بەشی هونەرەجوانەکان، هۆڵێکی تایبەتی لە ناو کۆشکەکەیدا تەرخان

کردبوو، بە وێنە و نیگار و تابلۆی ڕەنگاوڕەنگ ڕازاندبوویەوە، بێ گومان سوڵتان خۆی وێنەکێشێکی کارامە و لێهاتوو بوو! ! وە نمونەی ئەو تابلۆیانەی کە بەدەستی خۆی نەخشاندبوونی، بە دیاری تابلۆیەکی نارد بۆ باڵوێزی پێشوی ئەڵمانی الکونت (هاجفلت)(٤).

**٦- ئەندازیاری بیناسازی (الهندسة المعمارية):**

یەکێکی دیکە لە حەز و خولیاکانی سوڵتان عبدالحمید لە ئەندازیاری بیناسازیدا بوو، هونەرو داهێنانەکانی لە بواری بیناسازیدا نرخ و بەها و جوانکاری بێ ئەندازەیان هەبوو، دەتوانین مزگەوتی (یەڵدز) بە نمونە بهێنینەوە، کە بە شێوەیەکی زۆر جوان و سەرنج ڕاکێش بنیاد نرا بوو، بێ گومان سود لە هونەری بیناسازی سوڵتان عبدالحمید وەرگیرا بوو، ئەمەش ئەو ڕاستیە دەسەلمێنێت کە سوڵتان عبدالحمید کەسێکی بلیمەت و بێ هاوتا بووە لەو سەدەمەدا، بەتاییەت لە بواری هەنەری بیناسازیدا.

**٧- شیکردنەوەی کیمیایی :**

سوڵتان عبدالحمید هەستا بە دروست کردنی تاقیگەیەکی کیمیایی، کە تیایدا خۆی شی کردنەوەی بۆ ئەو خواردنەوانە دەکرد کە گومانیان لێ دەکرا، شایانی باسە خۆی هەڵدەستا بە ئەنجام دانی چەندین تاقی

---

(٤) کاظم سەید احمد کە کتێبەکەی ناوی (تاریخ الحیاة السلطان عبدالحمید الثانی)ە، هەروەها سوود وەرگیراوە لە گۆڤاری التربیە الآسلامیە، ژمارە چواری زولقەعدەی ساڵی (١٣٩٥) بە دەستکاری و کورت کردنەوەوە، وەرگێڕ .

کردنەوەی کیمیایی لە بوارە جۆراوجۆرەکان دا، ئەم تاقی کردنەوە و لێکۆڵینەوە کیمیاییانەشی بۆ ئەوە ئەنجام دەدا، تا زاناکانی بواری شی کردنەوەی کیمیایی سەردەمی خۆی سود لەو تاقی کردنەوە وەربگرن.

## سوڵتان عبدالحمید و گەیشتنی بە کورسی فەرمان ڕەوایی :

باوکی سوڵتان عبدالحمید ناوی (عبدالمجید[٥]) بوو لەساڵی (١٨٦١) دا کۆچی دوایی کرد، ئەمەش لە پاش ئەوەی کە نزیکی (٢٢) ساڵ لە

---

(٥) سوڵتان عبدالمجید داکۆکی دەکرد لە سەر تەفریج و ئینحیلال، ئەمەش لە پاش کۆتایی هاتنی جەنگی ( الرم ) لە ساڵی (١٨٥٥) دا کە نزیکەی سێ ساڵی خایاند، پێویستە ئاماژەش بەوە بدەین کە سوڵتان عبدالمجید بوو، ڕێگەی دا بە ئافرەتان تا واز لە باڵاپۆشی بهێنن و پەچەی دەم و چاویان لاببەن، وە هاوکاری ئافرەتانی دەکرد تا ڕوو بکەنە ژیانی بە ناو پێشکەوتووی ڕۆژئاوا و،هەوڵی دەدا و داوای دەکرد کە ئافرەتان لە شێوە و هەڵس و کەوت و جل و بەرگیاندا چاو لە ڕۆژئاوا بکەن !! هۆکاری ئەمەش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە سوڵتان عبدالمجید دەیویست پاڵپشتی و خۆشەویستی خۆی ئاشکرا بکات سەبارەت بە پێشکەوتن و ئازادی یەکانی ئەوروپا، لە بەر ئەوە ڕێگەی بە ئافرەتان دەدا خۆیان سەردانی بازاڕەکان بکەن و بەشداری بکەن لە بازرگانی و کڕین و فرۆشتنندا و بە ئارەزووی خۆیان بە بازاردا بگەڕێن تا ئەو شتومەکەی کە خواستیان لە سەریەتی بیکڕن .

کورسی فەرمان ڕەوایی دا مایەوە، شایانی باسە لە ساڵی (١٨٣٩) دا و لە پاش مردنی باوکی، سوڵتان عبدالعزیزی مامی جڵەوی فەرمان ڕەوایی گرتە دەست، تا ڕۆژی (٣٠) ی ئایاری (١٨٧٦) لە کورسی فەرمان ڕەوایی دا مایەوە و، سەر لە ئێوارەی ڕۆژی (٣٠) ی ئایاری (١٨٧٦)، بە فەرمانی کار بەدەستی مسوڵمانان، سوڵتان عبدالعزیز لە کورسی حوکم دوور خرایەوە بە بیانوی ئەوەی کە توانای عەقڵی لاوازە و کامڵ نیە، ئەمەش لە پاش ئەوەی کە کاربەدەستی مسوڵمانان لە گەڵ سوپادا کۆبونەوەیەکی ئەنجام دا و پاشان چوار دەوری کۆشکەکەی سوڵتان عبدالعزیزیان گەمارۆدا، دواتر چوونە لای عبدالعزیز و بڕیاری لە سەر کار لابردنەکە، کە لە لایەن شێخی ئیسلامەوە[٦] ڕەزامەندی لە سەر درابوو بۆیان خوێندەوە کە تایبەت بوو بە لادانی عبدالعزیز لە کورسی فەرمان ڕەوایی، دیارە بە فەرمانی کاربەدەستی مسوڵمانان، عبدالعزیز لە کورسی حوکم دوور خرایەوە، فەتوای شێخی ئیسلامیش تایبەت بوو بەو هەڵە و کەم و کورتیانەی کە عبدالعزیز لە ماوەی فەرمان ڕەوایی دا ئەنجامی دا بوون، لە کاتی خوێندنەوەی بڕیارەکەدا سوڵتان عبدالعزیز لە سەر کورسییەکەی دایە قاقای پێکەنین، پاشان خۆی دا بە دەستەوە و لە کۆشکی فەرمان

---

(٦) شێخی ئیسلام : لەو سەردەمە ی حوکم ڕانی تورکیادا بە بەرپرسی یەکەمی وڵات وتراوە .

ڕەوایی هێنرایە دەرەوە و، دواتر بەرە و پەناگەیەکی دوور لەو شوێنە بردیان بە بێ ئەوەی هیچ جۆرە ئازار و ئەشکەنجەیەك بدرێت، بەڵام دواتر و هەر لە هەمان شەودا خۆی کوشت، واتە لە(٣٠) ی ئایاری (١٨٧٦)دا؟!.

پاشان موورادی[٧] پێنجەم چووە سەر کورسی حوکم، کە ئەمیش کەسێك بوو نەخۆشی دەروونی هەبوو! هەروەها عەقڵ و مێشکی ناتەواو بوون، ئەم دۆخە نائاساییەی موورادی پێنجەمیش زۆر بە ئاشکرا لە لایەن خەڵکیەوە هەستی پێ دەکراو، بە کەسێکی (شێت) ناویان دەبرد، لە بەر ئەوە پێویست بوو کە ئەویش لە کورسی حوکم دوور بخرێتەوە، بۆ ئەو مەبەستەو لە (٣١) ی ئابی (١٨٧٦) دا، شێخی

---

(٧) سوڵتان موورادی پێنجەم لە ساڵی (١٨٤٠) دا لە دایك بووە، لە تەمەنی (٣٦) ساڵیدا جڵەوی فەرمان ڕەوایی وولاتی گرتە دەست و، لە ساڵی (١٩٠٤) دا کۆچی دوایی کرد، ناوبراو پەیوەندی پتەوی بە ئەندامانی لاوانی تورکیاوە هەبووە، وە بە شێوەی مادی و مەعنەوی پشتگیری دەکردن، وە لە ماوەی مانەوەیدا لە لەندەن لە ڕێگەی جێنشینی ئینگلیزەوە تێکەڵی بیری ماسۆنیەت بووە، ناوبراو زۆر شەیدای مۆسیقا بووە و مۆسیقای زۆر خۆش دەویست، هەروەها شارەزایی باشی لە زمانی فەڕەنسیدا هەبوو، شایانی باسە ئەم سوڵتانە تەنها (٩٣) ڕۆژ لە کورسی حوکم دا مایەوە، تەنانەت یەك ڕۆژیش نەهاتە ناو گەلەوە تا لە ئازار و نەهامەتی هاوڵاتیان ئاگادار بێت !!!؟

ئیسلام فەرمانی دوورخستنەوەی مورادی پێنجەمی دا لە کورسی فەرمان ڕەوایی، پاشان و ئیدی لێرەوە سوڵتان عبدالحمید هاتە سەر کورسی حوکم و بوو بە خەلیفەی مسوڵمانان، ئەمەش لە دوای ئەوە دێت کە بەیعەتی پێی درا لە یەکی ئەیلولی (١٨٧٦)داو دواتر بەرەو کۆشکی (طوب قبو) ڕۆیشتو پاشانیش بەرەو کۆشکی (بشکطاش) کەوتە ڕێ، شایانی باسە مسوڵمانان و زانایانی ئوممەتی ئیسلامی بەیعەتیان بە سوڵتان عبدالحمید داو، دواتر لە کۆشکی (یەڵدز) دا بە جێگیری مایەوە، بەو شێوازە و لە ماوەی سێ مانگدا دوو سوڵتان لە کورسی حوکم دوور خرانەوە و سوڵتان عبدالحمید لە پاش ئەو دوانە دیاری کرا بۆ ئەوەی کورسی فەرمان ڕەوایی دەوڵەتی ئیسلامی بگرێتە دەست...

لەیەکی ئەیلولی (١٨٧٦) کە تیایدا سوڵتان عبدالحمید کرایە خەلیفەی موسڵمانان، دەوڵەت کەوتبووە ژێر قەرزارییەکی زۆرەوە، کە قەرزەکانی تورکیا لەو کاتەدا لە دوو سەد ملیۆن جونەیهی ئیستەرلینی تێ پەڕی کردبوو، ئەمەش بۆ ئەو کات ڕێژەیەکی تەواو زۆر و خەیاڵی بوو، چونکە بە نمونە تێکڕای داهاتی بەرووبوومی کشتوکاڵی وڵات لەساڵی (١٨٧٣) دا لە بیست ملیۆن جونەیهی تێپەڕی نەدەکرد.

بەو شێوازە لە هەموو لایەکەوە کێشە ڕووی لە دەوڵەت کرد بوو، نەبوونی پارە و داتەپینی بواری ئابوری وڵات، هەروەها گەورەترین

کێشەی دەوڵەت بێ داهاتی بوو، هەروەك سەرهەڵدانی بیروبۆچوونی ڕەگەزپەرستی یەکێکی دی بوو لە کێشەکان، جگە لەوە هەژاریش تەواو چینەکانی گەلی شەکەت و ماندوکردبوو، ئیدی با ئەو هەموو موئامەرە ناوچەیی و جیهانیانە بوەستن کە هەوڵی لە باربردنی دەستەڵاتی عوسمانیەکانیان دەدا، هەمان کات دەوڵەتە داگیرکەرەکان بەردەوام هەوڵیان دەدا بگەنە ڕێکەوتنێك بۆ دابەش کردنی ناوچەکانی ژێر دەستەڵاتی عوسمانیەکان لە ناوخۆیاندا، کە ئەو کات بە پیاوە نەخۆشەکە(٨) ناویان دەبرد.

---

(٨) بە کارهێنانی دەستەواژەی (پیاوە نەخۆشەکە)، ئەم وشەیە تەفسیرێکی ڕاستە قینە نیە بۆ دۆخی دەوڵەتی عوسمانی، بەڵکو لەو کاتەدا لەلایەن دوژمنانەوە وەك نازناوێك بە سەری دا سەپێنرا بوو، هەمان کات ئەو وشە پڕوپاگەندەیەك بوو جولەکە و زایۆنیزم وەك جەنگێکی دەروونی دژی خەلافەتی عوسمانی بەکاریان دەهێنا، وە ئەم بانگەشەیە زیاتر لە دەرەوەی تورکیادا هەستی پێ دەکرا، ئەمەش لە پێناوی ئەوەدا بوو کە مسوڵمانان سارد بکەنەوە و گوێ نەدەنە یەك خستنی ڕیزەکانیان، چونکە خوای گەورە تەنها مسوڵمانان بە برای یەکتری ناو دەبات، لە بەر ئەوە پێویستە مسوڵمانان لە هەموو سەردەمێکدا دەست لە ناو دەست بن بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان، وە پێویستە ئێمەی موسڵمان هەموو ئاژاوە و ناکۆکیەك بخەینە لاوە بۆ ئەوەی نەبینە نێچیرێکی دەستی داگیرکەران، لە بەر ئەوە بە بەردەوامی ڕۆژئاوا و جولەکەکان کاریان لە سەر ئەوە کردووە کە برایەتی نێوان مسوڵمانان تێك بدەن، ئەم ئامانجەشیان بۆ

هەر لەم کاتەدا بەرپاکردنی شۆڕش لە وڵاتی بۆسنە و هەرسك و بولغاریا ڕاگەیەندرا، لەو ساتە دژوارو ناسکەدا دەوڵەت لە جەنگێکی قورسدا بوو لە گەڵ سرپەکان و بەڵقانیەکاندا، ئیتر با شەڕ و پێکدادانەکانی ڕوسیا لەو لاوە بوەستێت کە بە توندی دژایەتی ڕوسیا دەکرا، لە ساڵی (١٨٧٧)داو پاش ئەوەی کە ڕوسیا تێك شکا، ئەمە ڕێکەوتی بەرلینی هێنایە کایەوەو لە ساڵی (١٨٧٨) دا ئیدی لێرەوە قوبرس کەوتە ژێر دەستی ئینگلتەڕا.

هەروەها وڵاتی تونسیش کەوتە ژێر دەستی فەڕەنساو، میسر بە هاوبەشی درایە دەست فەڕەنسا و ئینگلتەڕا، وڵاتە زلهێزەکان لە پێش هەموویانەوە ئینگلتەڕا لە هەوڵدانی بەردەوامدا بوو بۆ بەستنی

---

هاتووەتە دی، وە بەردەوام زایۆنیەکان هەوڵیان داوە کە لە ناو جەرگەی ئوممەتی ئیسلامیەوە هەوڵی نانەوەی ئاژاوە بدەن، لەم هەوڵەشیاندا سەرکەوتوو بوون بە شێوەیەك کە زۆر جار مسوڵمانەکانیان نائومێد کردووە لەوەی کە هەوڵی یەکرێزی و تەبایی و پێشکەوتن و گەشەکردن بدەن، لێرەوە ئیدی نازناوی (پیاوە نەخۆشەکەیان) بە سەردا سەپاند، وەبەردەوام دەوڵەت ئامادەی ڕووخان بووە، وە هەموو دەستەو تاقم و گروپ و هۆزێك هەوڵی دەدا کە پشکی شێر بۆ خۆی ببات لە ناوچەکانی ژێر دەستەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی، هەروەك دەوڵەتە داگیرکەرەکانیش سەرگەرمی وتووێژ کردن بوون بۆ ئەوەی بە برایانە خاك و کانزاو سەروەت و سامانی ژێر دەستەڵاتی خەلافەت لە ناو خۆیاندا دابەش بکەن.

گۆنگرەیەك تایبەت بە ناوچەکانی بەڵقان و ناوچەکانی ژێر دەستەڵاتی عوسمانیەکان، بە بەردەوامی دەستیان وەردەدا لە کاروباری ناوخۆی دەوڵەتانی ژێر دەستەڵاتی خەلافەتی عوسمانیەکان. سەرەنجام لە (١٣) ی حوزەیرانی (١٨٧٨) دا گۆنگرەی بەرلین بەسترا بە بەشداری دوڵەتە زلهێزەکان (ئینگلتەڕا، فەڕەنسا، ئەڵمانیا) هەروەها (دزرائیلی) کە ناوبراو جولەکەیە و لە هەمان کاتدا سەرۆك وەزیرانی ئینگلتەڕا بوو، وەك نوێنەری ئینگلتەڕا لەو کۆبوونەوەدا بەشدار بوو، هەروەها (بسمارك) نوێنەرایەتی دەوڵەتی ئەڵمانیای دەکرد کە لە گۆنگرەکەدا دژی ئینگلتەڕا وەستایەوە، کۆبوونەوەکانی گۆنگرەی بەرلین چەند ڕۆژێك درێژەی کێشاو، لە کۆتاییدا گەیشتنە چەند بڕیارێك[٩].

---

(٩) گۆنگرەی بەرلینی (٢٢) ی حوزەیرانی (١٨٧٨) کۆمەڵێك بڕیاری دەرکرد لەوانە : پێدانی سەربەخۆیی بە هەریەکە لە ( ڕۆماو ئانیا و جەبەل ئەسوەد ) هەروەها سەربەخۆیی درایە وڵاتی بولغاریاش لە بەرامبەر پێدانی جزیەیەکی ساڵانە بە دەستەڵادارانی عوسمانی، هەمان کات ناوچەکانی مەقدۆنیا گەڕێنرانەوە بۆ ژێر دەستەڵاتی عوسمانی کە پێشتر لە ژێر دەستی بولغاریادا بوون بە پێی ڕێکەوتنی ( سان ئاستیفانو) بە بێ هەبوونی هیچ جۆرە مەرجێك، بەڵام ناوچەکانی ( الروم ایلی الشرقیە ) کە ناوچەکانی باشووری بولغاریا دەگرێتەوە سەربەخۆییان وەرگرت بە مەرجی ئەوەی کە فەرمانڕەواییەکی

لەوانەش داوایان کرد دەوڵەتی عوسمانی چەند نوێگەرییەك بکات لەیاسا و سیستەمی بەڕێوەبردنی وڵاتدا، بەڵام سوڵتان عبدالحمید ئامادە نەبوو بە هیچ شێوازێك دان بنێت بەو کۆنگرەیە و بڕیارەکانیاندا، بڕیارەکان تەنها بریتی بوون لە نوسینی سەر کاغەز! لە کات بە فیڕۆدان بەو لاوە هیچ سوودێکی دیکەیان نەبوو، بەڵام لەهەمان کاتدا دەوڵەتی عوسمانی سەرگەرمی ڕاهێنانی سوپاکەی بوو،

---

مەسیحی وڵاتەکەیان بەڕێوە ببات، کۆنگرەکە ڕەزامەندی دەربڕی کە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی دەریای ڕەش بکەوێتە ژێر ڕکێفی ڕوسیاوە کە شاری (**باطوم**، قارص) دەگرێتەوە .

هەروەها یۆنان بە هەرێمێکی سادەی پێ دراو بەوەش ڕازی بوو، وە کۆنگرەکە بڕیاری دا کە ڕۆمانیا واز لە هەرێمی ( باسارییا ) بهێنێت تا بدرێتە ڕوسیا، لە بەرامبەر ئەم هەرێمەدا ڕۆمانیا بە هەرێمی ( دبرویە) قەرەبوو کرایەوە کە ئەم هەرێمە لە چاو (باسارییا ) ی لە دەست چوودا گرنگییەکی ئەوتۆی نەبوو، پێویستە ئاماژە بەوە بدەین کە کاریگەری بڕیارەکانی ئەم کۆنگرەیە لە دواییدا دەرکەوت و سەرئەنجام ڕێگە درا بە نەمسا بۆ داگیر کردنی بۆسنە و هەرسك و سنجق، هەروەها دەوڵەتی عوسمانی کۆمەڵە ناوچەیەکی زۆر گرنگی لە دەست خۆیدا کە پێشتر لە ژێر دەستی خۆیدا بوون، کەبێ گومان بە فەرمانی دەوڵەتانی خۆرئاوا وازی لەو ناوچە گرنگانە هێنا .

سەرچاوە (**الدولة العثمانية والمسألة الشرقية**) دکتۆر محمد کمال السوقی.

هەموو ئەو بانگەشانەی بەرپەرچ دەدایەوە کە داوایان دەکرد، پشت بە دەوڵـەتانی ڕۆژئاوابیبەسـترێت و لەبەرامبـەردا واز لـەئاینی ئیـسلام بهێنرێت! چونکە کۆمـەڵێك هـەبوون کـە خـەڵکیان هـان دەدا تـا داوای سیستەمی ڕۆژئاوایی بکەن! ! بەکورتیەکـەی لـە ڕوانگـەی ئـابووری و سیاسیەوە بارودۆخی ناوچەکەو دەوڵەتی ئیسلامی بەو شێوازە بوو.

بەڵام لە ڕوانگەی (بەڕێوەربردن و کۆمەڵایەتی و ڕەوشت و... هتـد) لە هەندێك لەو دەوڵەتانە دا بەرتیل و فێـڵ و هـەژاری و نەخۆشـی و... بڵاو بوو بوویەوە.

بەردەوام دەوڵەت هـەوڵی دەدا کـە مـسوڵمانان وشـیار بکاتـەوە لـە چـۆنیەتی هـەڵس و کـەوت کردنیـان لـە گـەڵ ڕۆژئـاوادا لـە ڕوانگـەی ئیـسلامەوە، وە داوای دەکـرد دوژمنایـەتی بیروبۆچـوونە هەڵـەکانی ئەوروپا بکرێت و، بەردەوام هەوڵی دەدا سیاسەتێك پـەیڕەو بکـات کـە پارێزەری دەسـکەوت و دەسـتەڵاتی خەلافـەت بێـت و لـە لاواز بـوون و ڕوخـان بـە دووری بگرێـت، وە هـەوڵی دەدا گەشـە بـە بیروبۆچـوونە جوانەکانی کۆمەڵگەی ئیسلامی بدات، بە تایبەت ئـەو بیروبۆچوونانەی کـە جەمالـەدینی ئـەفغانی بانگەشـەی بـۆ دەکـردن لـە پـاش دوور خستنەوەی لە میـصر، هـەروەها دروشمـی (ئـەی مـسوڵمانانی جیهـان یەکگرن) یان بەرزکردبوویەوە، هەمان کات بـە دروشمـی (ایها الاسـلام

استیقظ) داوایان له ئوممەتی ئیسلامی دەکرد که به ئاگا بێنـەوە، ئـەم دوو دروشمه دەنگدانەوەیەکی باشیان هەبوو، ئیدی بـەردەوام هێرشـی نـارەوا دەکرایـه سـەر دەوڵـەتی عوسمـانی (کلادسـتۆن) ی سـەرۆکی حیزبـی ئـازادی بـەریتانیا لـه وتەیەکدا دەوڵـەتی عوسمـانی بـه نـەیار ودوژمنی خۆی ناوبرد، هەروەها لـه لایـەن چـەند کەسایەتییەکی پایـه بـەرزی فەرەنسا و بەریتانیاوه بـه (خـوێن مـژ) دەوڵـەتی عوسمانیـان ناوزەد دەکرد، هەمان کات جولەکه و زایۆنیەکان دەوڵەتی عوسمانیـان بەوه تاوانبار دەکرد که جولەکـەکان دەچەوسێنێتەوە! !! هـەروەها ماسـۆنیەکانیش دەوڵــەتی عوسمانیــان بــه دوژمنــی مرۆڤایــەتی و شارستانی و پێشکەوتن تۆمەتبار دەکردو، ڕوسیاش دەسـتی کـرد بـه نانەوەی ئاژاوه و پـشێوی لـه نـاو دەوڵـەتانی بـەڵقان دا، بـەو شـێوازه هـەموویان کـۆك و یـەك دەنـگ بـوون بـۆ دژایـەتی کردنـی خەلافـەتی عوسمانی و سـوڵتان عبدالحمیـد، بـه چـەك و تەقەمـەنی هاوکـاری دوو ڕووان و ئاژاوه چـیەکانیان دەکـرد تـا ئـەو دەوڵەتانـه لـه ژێـر حـوکمی ئیـسلامی دەربهێـنن، وه داوا دەکـرا مەسـیحیەکان لـه دەسـت ئـەو مـسوڵمانانه ڕزگـار بکـەن، کـه بـەردەوام بەحـسابی خۆیـان لەلایـەن موسڵمانانەوه دەچەوسێنرانەوەو ستەمیان لێ دەکرا! !!!

ئیدی لێرەوە نەخشەی دوژمنان بۆ لە ناوبردنی دەستەڵاتی سوڵتان عبدالحمید و ڕوخاندنی خەلافەتی عوسمانی پێی نایە قۆناغێکی نوێوە، جولەکە بۆنەکانی ماسۆنیەت و زایۆنیزمی جیهانیان لە فەڕەنسا و ئینگلتەڕا و ئیتاڵیادا بە کار دەهێنا، بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەشەی درۆ بەوەی کە مسوڵمانان دژی ماسۆنیەتن، بەردەوام کاریان بریتی بوو لە ڕەخنە گرتن لە خەلافەتی ئیسلامی، ئەم ڕەخنانەش هەموویان لەسەر بنەمایەکی درۆ دەگێران و، جگە لە کینەو بوغز لەدژی ئیسلام و موسڵمانان هیچی تر نەبوو لە پشتیانەوە!!!! سەرئەنجام بانگەشەی درۆ دژی سوڵتان عبدالحمید گەیشتە ئاستێك کە لە هەموانیان واگەیاند بوو و خەلافەت و خودی سوڵتان عبدالحمیدیان کردبوو بە ڕەمزی ستەم و زۆرداری و دڵرەقی و نەزانی و ترسنۆکی و... هتد.

بە بەردەوامی جولەکە و دەوڵەتە زلهێزەکانی تر هەوڵیان دەدا کە سوڵتان عبدالحمید لە کورسی حوکم دوور بخەنەوە، سەرئەنجام ئەو هەوڵەشیان سەری گرت، لە کاتێکدا کە لە ناو گروپی (اتحاد الترقی) و پارتی لاوانی تورکیاوە، حەزی ئەوە هەبوو کە سوڵتان لە سەر کار

لابېرێت، پاشان کاربەدەستی وڵات بڕیاری دا کە سوڵتان عبدالحمید لە کورسی دەستەڵات دوور بخرێتەوە[١٠].

(١٠) لەو بەیاننامە نهێنیەی کە بووە هۆی ئەنجام دانی کۆدەتای سەربازی و دوور خستنەوەی سوڵتان عبدالحمید لە حوکم تیایدا هاتووە : – دانوستانەکان دەستیان پێ کرد لە پاش ئەوەی کە سەربازە مەقدۆنیەکان چوونە ناو پایەختەوە، شایانی باسە ماسۆنیەکان دەورێکی سەرەکییان لە گرتنی پایەختدا و داڕنینی دەستەڵات لە سوڵتان عبدالحمید بینی، کە بەردەوام زۆر توند بوو لە بەرامبەر ماسۆنیەکاندا، چونکە سوڵتان عبدالحمید ماسۆنیەتی بە کۆمەڵەیەکی سیاسی نهێنی مەترسیدار دەزانی، هەروەك لەو بەیاننامە نهێنیەدا هاتووە کە :پاش ئەوەی کۆتایی بە فەرمان ڕەوایەتی سوڵتان عبدالحمید هێنرا، ڕۆژنامەکانی جولەکە بە گەرمی پیرۆز بایی خۆیان ڕاگەیاند بە بۆنەی کۆتایی هێنان بە فەرمان ڕەوایی (سوڵتان عبدالحمید ) کە بە چەوسێنەری جولەکە ناویان دەبرد، ئەم بوختانەی ئەوان بۆ سوڵتان لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو کە سوڵتان عبدالحمید دوو جار داواکاری (هرتزل) ی جولەکەکانی بەرپەرچ داوەتەوە کە هرتزل کتێبی ( دەوڵەتی جولەکە ) ی دەرکرد ئەم کتێبە بە خاڵێکی گۆڕانکاری لە مێژووی زایۆنیەتدا دادەنرێت، لە ساڵی (١٨٩٧) دا هرتزل یەکەم گۆنگرەی زایۆنی (بازل) ی لەسویسرا بەست، بڕیاری دا بە دروست کردنی دەوڵەتێکی نەتەوەیی بۆ جولەکە لە فەلەستین دا، کە ئەمەش یەکەم قۆناغی دروست کردنی دەوڵەتی جولەکەیە لە نیلەوە بۆ فورات، وە لە گۆنگرەی زایۆنیەکاندا کە لە کانونی یەکەمی ساڵی (١٩٠٩) بەستران، داوای کرد کە کۆچی زایۆنیزم بۆ هەموو وڵاتانی جیهان بوەستێنرێت جگە لە فەلەستین! ئەم بەڵگە نامە نهێنیە لە گۆڤاری ( الافاق العربیە ) لە ژمارەی نۆهەمی ئایاری (١٩٧٨) دا بڵاوکراوەتەوە، وە فەیلەسوف (ماسۆنی – شاریبا ) لە ئاهەنگێکی ماسۆنیەکاندا دەڵێت : سەیری برا ماسۆنیەکانتان بکەن کە هەستان بە ئەنجامدانی بزووتنەوەیەکی دەستوری کە بووە هۆکاری کۆدەتا کردن بە سەر دەوڵەتی عوسمانیەکاندا، لە سەردەمی فەرمان ڕەوایی سوڵتان عبدالحمید دا بەبێ ئەوەی دڵۆپێك خوێن بڕژێت !!

لە پاش دەرچوونی بڕیارەکە، چوار کاربەدەستی ناوچەکانی دەوڵەتی عوسمانی ڕوویان کردە کۆشکی (یەڵدز) کە بریتی بوون لە :

(١) عارف حیکمەت[١١] :کە پلەدارێکی هێزە دەریاییەکانی دەوڵەتی عوسمانی بوو.

---

(١١) عارف حیکمەت پلەدارێکی هێزەدەریایەکان بوو هەروەها ئەندامی ئەنجومەنی (الاعیان) بوو، کە ئەم پیاوە دژی هەموو ئەو پلە و ڕووتبەو چاکانە دەوەستایەوە کە لە لایەن سوڵتان عبدالحمیدەوە پێی بەخشرابوون، هەروەها بەشداری کردنی لە ناو ئەو وەفدەدا کە بۆ گەیاندنی ئەو پەیامە تایبەتە بە سوڵتان هاتبون، تەنانەت عارف حیکمەت بە پشتیوانی سوڵتان عبدالحمید دوا پلەشی بە دەست هێنا کە فەرماندەیی هێزە دەریاییەکان بوو . سوڵتان عبدالحمید لەو کاتەدا ڕووی تێ کردوو پێی ووت : ئایا عارف حیکمەت تۆم بە هەتیوی لەم کۆشکەدا گەورە نەکرد ؟ دیاری دایکی عارف یەکێك بوو لە کار گوزارەکانی کۆشکی سوڵتان، پاشان سوڵتان عبدالحمید، عارف حیکمەت دەخاتە قوتابخانەی ( سەربازی — دەریایی ) یەوە پاشان دەینێرێت بۆ ئەوروپا تا پلەی (ارکان حرب) ی بەدەست هێنا، بەڵێ بەردەوام سوڵتان عبدالحمید بە گاڵتە جاڕییەوە قسەی لە گەڵ عارفدا دەکرد، بێ گومان ئەگەر عارف حیکمەت تۆزێك ویژدان و کەرامەت و حەیای هەبوایە، ئەوا دەست بەجێ لە شەرمدا دەمرد ؟ چونکە عارف پەروەردەکراوی کۆشکی سوڵتان بوو بەڵام خیانەتی لە سوڵتان کرد، بە بەردەوام سوڵتان کارە باشەکانی خۆی وەبیر عارف دەخستەوە و عارفیش لە شەرمەزاریدا نەیدەتوانێ زمان بجوڵێنێ .

(٢) مـزراح ئەفەنـدی[١٢] : کـە ئەنـدامی ئەنجومـەنی (اعیـان) بـوو، هەمان کات جولەکەیەکی زۆر داخ لە دڵ بوو.

---

(١٢) ئەم پیاوە پارێزەرێکی جولەکە بوو، کە لە بنەچەدا خەڵکی ئیسپانیابوو، یەکێك بووە لە ئەندامە باڵاکانی ( اتحاد الترقی ) و بەرپرسـی بەشـی ڕێکخسـتنی ئەو کۆمەڵە بووە، ناوبراو ڕۆڵێکی زۆری گێڕا لە ئاسانکاری کردن بـۆ داگیرکردنـی لیبیا لە لایەن ئیتاڵیاوە، پاش ئەوەی کە تاوانی کۆکردنەوەی سامانی بـە سـەردا ساغ دەبێتەوە، هەڵدێت بەرە و ئیتاڵیـا و ناسـنامەی ئـەو وڵاتـەی پـێ دەدرێـت، ناوبراو پلەیەکی باڵای لە ماسۆنیەتدا هەبووە تا ئەو ئەندازەیەی پلـەی ئوسـتازی لە ماسۆنیەتدا بە دەسـت هێنـاوە، تـا مردنـی لـە ترینـا ماوەیـەوە کـە لـە سـاڵی (١٩٣٤) مرد .هەروەها لە لایەن بانکی ئیتاڵیاوە چوارسەد هـەزار لـیرەی ئـاڵتونی دراوەتە ئەم پیاوە تا بیداتە دەستی ( نەجیب دراغا ) ئەمیش ئەو بـڕە پارەیـەی تەسلیمی (ئەیوب سەبری) کرد کە ئەندامێکی ( اتحاد الترقی ) بـوو، ئـەم پارەیـە بۆ ئەوە دابین کرابوو، تا قەسابخانەکەی (٣١) ی ئاياری پـێ ئـەنجام بـدرێت کـە ئەم قەسابخانەیە کۆتایی بە حوکمی سـوڵتان عبدالحمیـد هێنـا، مـزراح ئەفەنـدی خاوەنی ناسنامەی ئیتاڵی و ناسنامەی دەوڵەتی عوسمانیش بوو، مزراح ئەفەندی لە پاش کۆتـایی هـاتنی حـوکمی سـوڵتان عبدالحمیـد بـە شـانازییەوە دەیـووت : ئیتیحادیەکان بە بڕی چوارسەد هەزار لیرە توانییان ئەوە جێ بـە جـێ بکـەن کـە دەیان ویست، کە سوڵتان عبدالحمید نەیدەیتوانی بە پێـنج ملیـۆن لـیرەش ئـەوە جێ بە جێ بکات، ئیدی لێرەوە ڕێ بە جولەکەکان درا کە بەرە و فەلەستین کۆچ بکەن کە زۆرێك لـە بەشـداربووان لـە کۆمـەڵی ( ترکیـا الفتـاە) بـوون، سەرچـاوە

(٣) ئرستید[١٣] پاشای (ڕۆمی) کە وەزیری پێشووی بەرژەوەندیەکانی دەوڵەتی عوسمانی بوو.

---

ئینگلیزەکان بە گەورە بەرپرسانی (اتحاد الترقی) ناویان دەبردن، لەئەنجامدا بە هۆی ئەنجام دانی ئەو خیانەتە لە دژی دەوڵەتی عوسمانی بەرەو ئیتاڵیا هەڵهاتن، هەمان کات عارف حیکمەت ئەندام پەرلەمانی تورکیاش بووە، هەندێك سەرچاوەش بەوە ناوی دەبەن کە بانگەشەی بۆ بیروبۆچوونی کۆمەڵی ( ترکیا الفتاة) کردووە، لە کۆبوونەوە تایبەتەکانی ماسۆنیەتداو لە پەرلەمانی تورکیادا، مزراح ئەفەندی و باقی ئەندام پەرلەمانە جولەکەکان وا خۆیان پیشان دەدا کە لەبەر بەرژەوەندی تورکیا هەموو شتێك دەکەن کە ئەمەش بانگەشەیەکی تەقلیدی جولەکە تورکەکان بوو .

(١٣) ئرستید پاشا : ماوەیەك ڕاوێژکاری بواری دارایی بووەو، پاشان وەزیری بەرژەوەندییەکان و دواتر بووە بە ئەندامی (مجلس الاعیان)، ناوبراو هاندەری سەرەکی ئەرمەنەکان بووە و ئەوانی خستۆتە سەر ئەو ڕێگەیەی کەوا بزانن سوڵتان عبدالحمید هۆکاری سەرەکی نەهامەتییەکانیانە، ئەم پیاوە دانی بە هەموو ئەو یارمەتیانەدا ناوە کە لە ڕووی سەربازی وداراییەوە پێشکەشی ( اتحاد الترقی) کردوون، ناوبراو هەر لە لایەن ئەرمەنەکانەوە دیاری کرا تا سەرۆکایەتی و پێشڕەوایەتی ئەوانە بکات کە دەیانەوێت تۆڵە لە سوڵتان عبدالحمید بکەنەوە.

سوڵتان عبدالحمید پرسیاری لێ کردبوو : کێ تۆی کردە ڕاوێژکاری دارایی و پاشان تۆی کردە وەزیر و دواتر بۆ ئەندامێتی پەرلەمان ؟!! ئرستید بێ دەنگ بوو، لەشەرمەزاریدا ووشەیەك لە زاری نەهاتە دەرەوە ..

(٤) ئەسعەد پاشا، کە ئەم پیاوە لـە بنـچینەدا ئـەلبانی نـەژاد بـوو، ناوبراو سەرپەرشتیاری ناوچەی (دراج) بووەو، سوڵتان عبدالحمیـد زۆر کـاری بـۆ ئەسـعەد پاشـا ئـەنجام داوە و فـەزڵی زۆری بەسـەریەوە هەبووە، بەڵام ئەسعەد پاشا خیانـەتی لـە سـوڵتان کـردووە بـە نهێنـی ئەندامانی (اتحـاد والترقـی) لـە نـاو کۆشـکی سـوڵتاندا دامەزرانـدووەو، ناوبراو یەکێك بووە لە کەسە نزیکەکانی سوڵتان عبدالحمید.. !؟

سـەرئەنجامئەم چـوار کەسـە چـوونە نـاو کۆشـکی سـوڵتان عبدالحمیدەوە، ئەویش زۆر بـە گەرمیـەوە پێـشوازی لیٚ کـردن، بـە بـیٚ ئەوەی سـوڵتان ئاگـاداری ئـەوە بێـت کـە ئـەم چوار کەسـە تاوانبـارە نەخشەیەکی دۆزەخی لەهەگبەیاندایـە بەئاڕاستەی ڕماندنی دەوڵـەتی ئیسلامی و لادانی سوڵتان عبدالحمید لەکورسی فەرمان ڕەوایی،پاشـان هـەر چـواریان لـە بـەردەم کەسـایەتییەکی گـەورەی وەك سـوڵتان عبدالحمید دا وەستان، نەیان ئەتوانی ڕێگەی توند و تیژی بگرنـە بـەر، بەڵکو لە گەڵ کارە چەپەڵەکەیان دا هەوڵیان دەدا بـە جـوانی هـەڵس و کەوت بکەن لەگەڵ سوڵتاندا، هەروەك عارف حیکمـەت زۆر بـە ڕێـزەوە سڵاوی لە سوڵتان عبدالحمید کـرد کـاتیٚ ئـەوەی بیرکەوتـەوە کـە ئـەم ڕۆژێك لـە ڕۆژان لـە ژێـر فـەرمانی سـوڵتان عبدالحمیـدا کـە (گـەورەی مـسوڵمانان بـووە) بـە فـەرمانی ئـەو هەڵـسوکەوتی کـردووە، عـارف

حیکمەت شەرمەزاری دەیگرت کاتێك ئەو ڕۆژانەی وەبیردەهاتنەوە، کە ئەو ئەفسەرێك بووە لە ئەفسەرەکانی سوڵتان عبدالحمید و بە پیشتیوانی ئەو پێ گەیشت.

بەڵام جولەکە ناپاکەکە بە شێوەیەکی زۆر بێ ڕێزانە دەستی بەرە و سوڵتان درێژ دەکرد، کە بەیاننامەی (دوورخستنە وەی سوڵتان لە کورسی فەرمان ڕەوایی) بەدەستی ئەوەوە بوو و بەرەو ڕووی سوڵتان ڕای دەوەشاند، وە بە شێویەکی زۆر بێ شەرمانە ڕووی کردە سوڵتان وڕایگەیاند : ئوممەت تۆی لە دەستەڵات لابرد سوڵتانیش وەڵامی دایەوە : بەڵکو ئێوە ئەوەتان دەوێت، ئێوە ئەو قسەیەتان دەوێت، ئێوە دەتانەوێت من لە دەستەڵات دوور بخەنەوە!!

بەڵام هەریەکە لە (ئرستید ڕۆمی و ئەسعەد پاشا) بێ دەنگیان هەڵبژارد بوو بە شێوەیەك وا هەستت دەکرد ئەوان لە سەر ئەم دونیایەدا نین؟!!

سوڵتان بەردەوام بە گاڵتە پێ کردنەوە قسەی لە گەڵ دەکردن و لێی دەپرسین: ئایا ئێوە لە هاوکارانی من نەبوون؟ وەڵامیان بە بەڵێ دەدایەوە؟ پاشان لێی پرسین: کێ ئێوەی کرد بە هاوکاری من و ئەو پلەیەی پێدان؟ هەموویان بێ دەنگ بوون، تەنانەت یەك وشە لە زاریان نەهاتەدەرێ!!؟؟

هەروەها سوڵـتان پرسیاری لێ کردن : ئـەو بەڵگـە شـەرعیە کامەیـە کە کردوتانە بە بەڵگە تا بە هۆیەوە من لە دەستەڵات دوور بخەنـەوە؟ پاشـان عـارف حیکمـەت لاپەڕەیـەکی دەرهێنـا کـە فـەتواکانی شـێخی ئیسلامی تێدابوو، سەبارەت بە لە کار لابردنی سوڵتان و تیایدا هـاتبوو : کاتێك ئیمـامی مـسوڵمانان ڕاهـات بـە ئـارەزووی خـۆی هەڵـسوکەوت بکات و،لە کتێبە شەرعیەکاندا هەندێك بابـەتی شـەرعی گـرنگ لاببـات، یان ڕێگری بکات لە هەندێك بابـەت لـەو کتێبانـەدا، یـاخود هەنـدێکیان بدڕێنێت یاخود بیانسوتێنێت... لێرەدا سـوڵتان قـسەکەی بـە عـارف پچڕاند و وتـی: ((حـسبنا الله ونعـم الوکیـل، کـام کتێبـەم سـوتاندووە؟ حسبنا الله ونعم الوکیل)).

عارف حیکمەت بەردەوام بوو لـە خوێندنـەوەی فەتواکانـدا، بـە بـێ ئـەوەی کـەمترین زانیـاری هـەبێت و کـەمترین دانـایی هـەبێت... لـە فەتواکاندا هاتبوو: سوڵتان عبدالحمیـد زیـادەڕەوی کـردووە لـە خـەرج کردنی پـارەی (بیـت المـال) دا و بـە هـەدەری داوە و، بـە شـێوەیەکی ناشـەرعی هـەڵس و کـەوتی بـە پـارەی (بیـت المـال) ەوە کـردووە، هـەروەها سـوڵتان تاوانبـار کرابـوو بـە کوشـتن و بەنـدکردن و دوورخستنەوەی خەڵکی لە وڵات، هەروەها لەفەتواکاندا جۆرەها زوڵم و زۆر و ستەم بە ناڕەوا درابویە پاڵ سوڵتان عبدالحمیـد، کـە سـەرجەمی

فەتواکان ئاماژەیان بەوە دابوو سوڵتان بە بێ هیچ جۆرە پاساوێك هەستاوە بە ئەنجام دانی ئەم تاوانانە... پاشان لە درێژەی فەتواکانـدا ئاماژە بەوە کراوە ئەگەر سوڵتان لەم کردەوانەش پەشیمان بێتـەوە و داوای لێ بوردن لە خوای گەورە بکات و ڕێگەی چاکسازی و کـردەوەی باش بگرێتە بەر، ئەوا دووبارە هەر موسڵمانان دوچاری زیان دەبن بـە مانـەوەی سـوڵتان عبدالحمیـد لـە کورسـی دەسـتەڵاتدا، کۆمـەڵێك لـەو بڕوایـەدا بـوون، مانـەوەی سـوڵتان عبدالحمیـد لـە کورسـی حوکمـدا زیـانێکی گـەورەی لێ دەکەوێتـەوە و، دوور خـستنەوەی سـوڵتان لـە دەستەڵات ئەگەرەکانی چاکسازی لـە وڵاتـدا زیـاتر دەکـات، بۆچـونیان وەهابوو دەیان گـوت پێویـستە یـەکێك لـەو دوو کـارە ئـەنجام بـدرێت، لابردنی سوڵتان لە کورسـی فـەرمان ڕەوایـی، یـان داوای لێ بکرێت بۆ خـۆی واز لـە دەسـتەڵات بهێنێـت، ئەمـەش لـە ڕوانگـەی بڕیارەکـانی (مجلس الحل والعقـد) کـە ئـەو کـات دەوری شـورای بینیـوە، بـەبڕوای ئـاژاوە چـییەکان پێویـست بـوو سـوڵتان یـەکێك لـەو دوو داوایـە هەڵبژێرێت؟ !!

پاشـان سـوڵتان عبدالحمیـد ڕووی کـردە جولەکەکـە و ئـەوەی وەبیرهێنایەوە،کە پێش شەش ساڵ لەمەوبـەر هـەمان کەسـی جولەکـە (مزراحی قەرەصو) هاتووەتە لای سوڵتان و داوای لێ کردووە، ڕێگە بە

جولەکەکان بدات تا لە فەلّەستین دا نیشتەجیّ ببن، لە بەرامبەر پیّدانی بڕیّك پارە بە ئەمیری باوەڕداران.

بەلّیّ سولّتان عبدالحمیدی (بریندار) کراو بە دەستی ئەم نەفام و سپلاّنە، دەیویست ئەم جولەکە ناپاکە تیّ بگەیەنیّت لەوەی کە ئەمە هەلّویّستی ئیّستای ئەو جولەکەیەیە کە سولّتان لە سەر کار لادەبات، لە کاتیّکدا شەش سالّ لەمەوبەر بە زەلیلی و مەمنونیەوە داوای لە سولّتان کردووە کە هەندیّك لە خاکی فەلّەستینیان بە کریّ بداتیّ تا کۆچ بکەن بۆ فەلّەستین، جولەکە بۆ خۆیان باش دەزانن کە سولّتان عبدالحمید، چەند توند بووە لە بەرامبەر بەرگری کردن لە قودسی پیرۆز و فەلّەستیندا.

وتەکانی سولّتان عبدالحمید زۆر بەهیّز و ڕوون و ئاشکرا بوون، بە بی ترس قسەی دلّی خۆی دەکرد لە کاتیّکدا ڕووبەڕووی ئەوە بوو بوویەوە کە لە سەر کورسی حوکم لاببریّت، لە لایەن دوو کەسەوە کە یەکیّکیان گاوریّکی ڕۆمانی بوو، ئەوی دیکەیان جولەکەیەکی ماسۆنی بوو، سولّتان عبدالحمید بەم شیّوەیە کۆتایی بەقسەکانی هیّناو وتی: هاتننتان بۆ ئیّرە بۆ ئەوەی کە فەرمانی دوورخستنەوەی سولّتانی دەولّەتی عوسمانی و خەلیفەی باوەڕداران لە حوکم ڕابگەیەنن، لە

داهاتودا ئێوەو ئەوەیشی ئێوەی ناردووە بۆ ئەم کارە دووچاری نەهامەتی و پەشیمانی دەکاتەوە [١٤].

لە درێژەی وتەکانیدا سوڵتان عبدالحمید ڕایگەیاند (بە درێژایی( ٣٣ ) ساڵ لە پێناو ئوممەت و دەوڵەتی ئیسلامیدا هەوڵ و کۆششم کردووە، لە پێناوی هێمنایەتی و ئاشتی وڵاتدا هەوڵی زۆرم داوە، بە پێی وزەو توانای خۆم خزمەتم کردووە!! من لە ژێر ڕۆشنایی فەرمانەکانی خواو پێغەمبەر( ﷺ ) دا حوکمی وڵاتم کردووە، من بەو شێوازە ووڵات تەسلیم دەکەمەوە کە کاتی خۆی ئەو ئەرکەم هەر بەو شێوەیە پێ درا، وەکو خۆی ئەو ئەمانەتە تەسلیم دەکەمەوە، هەرگیزای هەرگیز بستێك زەوی ئیسلامم فەرامۆش نەکردووە، خوای گەورە ئاگادارە بە هەوڵ و کۆششەکانم، بە پێی توانای خۆم هەوڵم داوەو، مەکرو فێڵی دوژمنانیشم سەر ناگرێت ئەگەر بیانەوێت پەردەی ڕەش بدەن بە سەر خزمەتەکانمدا بۆ ووڵات و ئومەتی ئیسلامی!!.)

---

(١٤) لە یادەوەرییەکانی سوڵتاندا هاتووە : کە پاش ئەوەی لە دەستەڵات دوور خراوەتەوە، و تویەتی : ( ئەوان سوڵتان عبدالحمیدیان نەڕوخاندووە !! بەڵکو ئەوان دەوڵەتی عوسمانییان ڕوخاند ) دواتر هەست بەم ڕاستەقینەیە کرا .

پاشان سوڵتان عبدالحمید خۆی ئامادە نەبوو نامەکە لە دەست جوەکە وەربگرێت، لە بەر ئەوە فەرمانی کرد بە هاوکارەکەی (دەلی جەودەت) کە نامەکە لە جولەکە ماسۆنیەکە وەربگرێت، پاشان ئەویش نامەکەی دا بە دەستی عائیشەی کچی سوڵتان عبدالحمیدەوە.

پاشان سوڵتان عبدالحمید داوای لە عارف حیکمەت و باقی بەرپرسەکان کرد ڕێگەی بدەن تا ئەو تەمەنەی کە ماویەتی لە کۆشکی (چراخان) لە پەرستشی خوای گەورەدا بەسەری ببات، بەڵام لەلایەن ئەو تاوانبارو سپلانەوە داواکەی سوڵتان بەرپەرچ درایەوە.

ئیدی لەمەو دوا پەردە درا بەسەر ژیانی ئاشکرای سوڵتان عبدالحمیددا و، لێرەوە ژیانی تاریکی ناو بەندیخانە دەستی پێ کرد!؟ پاشان سوڵتان ڕەوانەکرا بۆ ناوچەی (سالۆنیك) کە ناو جەرگەی جولەکە و ماسۆنیەکان بوو، لە کۆشکی (علاتینی) بەندیان کرد لە لای کۆمەڵەی ئیتحاد و تەرەقی و جولەکە ئیتالیەکاندا! عەقید (ڕەزمی) یان کرد بە سەرپەرشتیاری سوڵتان عبدالحمید، هەموو جۆرە سزایەکی دەروونیان لە سەر سوڵتان تاقی دەکردەوە، تەنانەت ڕێگەیان نەدەدا سەیری باخچەی بەندیخانەکەش بکات، هەروەها ڕێگر بوون لەوەی کە سوڵتان چاوی بە خێزان و منداڵ و خزم و دۆستانی بکەوێت!! تەنها یەك ڕۆژ ڕێگەیان دا بە سوڵتان تا دەرەوەی

بەندینخانەکەی ببینێت؟ ئەویش لەبەر ئەوە بوو کە ئەو ڕۆژە خەریکی ئاهەنگ گێڕان بوون بۆ (ساندایسکی) کە ئەم پیاوە دوژمنێکی سەرسەختی سولّتان عبدالحمید بووە.

پاشان سولّتان عبدالحمید بڕیاری دا هەموو سەروەت و سامانەکەی ببەخشێتە ئەوان لە بەرامبەردا سولّتان داوای کرد کە ئەم کارانەی بۆ جێ بە جێ بکەن:

- ڕێگە بدەن کە عبدالرحیمی کوڕی بچێتەوە بۆ ئەستەمبولّ، بەمەبەستی تەواو کردنی خوێندنەکەی.

-ڕێگە بە کچەکانی بدەن تا بگەڕێنەوە بۆ ئەستەمبولّ و، ژیانی هاوسەری پێك بێنن.

-سەربەستی تەواو بدەنە کارگوزارەکانی کۆشك و کارگوزارە تایبەتیەکانی خۆیی و ئازادیان بکەن.

-بڕێك پارە لە سەروەتەکەی خۆی بۆ بگێڕنەوە بۆ خەرجی مالّ و مندالّ و خێزانەکەی، ئەوەندەی کە بەشیان بکات.

-داوای کرد کە لێی گەڕێن تا بە ئیسراحەت لە بەندیەنخانەکەدا بژی، چی دی ئازاری دەروونی نەدەن، وە لە بەرامبەردا داوا لە سوپا کرا کە پارێزەری سولّتان عبدالحمید بێت.

بەڵێ گەورە بەرپرسانی سوپا ڕەزامەندییان لە سەر داواکەی سوڵتان دەربڕی، هەموو ماڵ و سەروەتەکەی سوڵتانیان وەرگرت، تەنها هەزار لیرەیان تەرخان کرد بۆ ژیانی خۆیی و هەموو ئەوانەیشی کە دەیانەوێت لە بەندینخانەدا لە گەڵ ئەودا بژین.

لە کاتێکدا سوڵتان سەرگەرمی وەرگرتنی هەوایەکی پاکژ بوو لە پەنجەرەی بەندیخانەکەیەوە ! سەرئەنجام و لەو کاتەدا لە لایەن (سالم کوردی) ناوێکەوە، تەقە لە سوڵتان کرا، ئەم سالم کوردیە یەکێك بووە لە پاسەوانەکانی ئەم بەندیخانەیە، گوللەکە لە نزیك سوڵتاندا تەقییەوە، بەڵام خۆش بەختانە سوڵتان دووچاری زیان نەبوو، پاشان سوڵتان عبدالحمید داوای کرد کە چاوی بە (ڕاسم بەگ) بکەوێت کە ناوبراو سەرۆکی پاسەوانەکان بوو، پاشان (ڕاسم بەگ) ی لەو ڕووداوە ئاگادار کردەوە و قەباخی گوللەکەی تەسلیمی (ڕاسم بەگ) کرد ئەویش وەری گرت و، خۆشحاڵی خۆی بەسەلامەتی سوڵتان دەربڕی، بڕیاریشی دا سزای سالم کوردی بدات، بەڵام بەڵێنەکەی نەبردە سەر و سزای نەدا ! ! ؟.

کاتێك پرسیار لە (سالم کوردی) کراوە لەبارەی هۆکاری تەقەکردن لە سوڵتان عبدالحمید ناوبراو وتوویەتی : من ویستم بە لە ناوبردنی ڕزگارمان بێت لە دەستی ! ؟ چونکە هەرکەسێك بتوانێت سوڵتان

بکوژێت ئەوا پلەیەکی زۆر گەورەی لە لایەن ئیتیحادیەکانەوە پێ دەدرێت! ! ؟

پێش دەست پێ کردنی یەکەمین جەنگی جیهانی، سوڵتان عبدالحمید گوازرایەوە بۆ کۆشکی (بیلربی) و لەو کۆشکەدا بەندکرا! ! ڕێگەیان بە کەس نەدەدا سەردانی سوڵتان بکات، تەنانەت ڕێگە بە خێزان و منداڵەکانیشی نەدەدرا کە سەردانی بکەن، بەو شێوازە چاودێریەکی زۆر توند خرابوویەسەر سوڵتان عبدالحمید.

عائیشەی کچی سوڵتان عبدالحمید دەڵێت: لەو ماوەیەدا کە سەردانی کردنی بابم لێمان قەدەغەکرا بوو، من لە دوورەوە و بە دووربین سەیری باوکمم دەکرد! !

بەڵام سەرەنجام ناچار کران کە ڕێگە بە سوڵتان بدەن بۆ ئەوەی چاوی بە منداڵ و ئەندامانی خێزانەکەی بکەوێت لە کوڕ و کچ و خزم و دۆستەکانی، ئەم چاوپێکەوتنەش ساڵی یەك جار ڕێگەی پێدەدرا ئەویش لە ڕۆژی یەکەمی جەژنی قوربانەدا دەبوو لە کاتژمێر یەك بۆ کاتژمێر چواری سەر لە ئێوارە! ! ؟

## دوا ساتەکانی ژیانی سوڵتان عبدالحمید

لە بەندیخانەدا سوڵتان عبدالحمید دوچاری نەخۆشیەکی کوشندە بوو، پزیشك هات چارەسەری بکات سەرەتا ڕازی نەبوو کە چارەسەری بکات، بەڵام دواتر سوڵتان ڕەزامەندی دەربڕی تا پزیشکەکە پشکنینی بۆ بکات، سوڵتان دووچاری نەخۆشی تەنگە نەفەسی بوو بوو، پاشان لە لایەن پزیشکەکانەوە خوێنی پێویستی بۆ دابین کرا،چونکە دوچاری کەم خوێنیش هاتبوو، پاش ئەوەی کە پزیشکەکان (سوڵتان عبدالحمید) یان بە جێ هێشت (ڕاسم بەگ) دەستی کرد بە گریان و هۆن هۆن فرمێسك لە چاوەکانی دەهاتە خوارەوەو وتی : ئەی گەورەم لێم ببورە، من بەرامبەر جەنابت کەم تەرخەم بووم، داوای لێ خۆش بونم لە خوای گەورە بۆ بکە؟ لەو کاتەدا سوڵتان عبدالحمید سەیری هاوسەرەکەی خۆی کرد و پێی ڕاگەیاند : (ڕاسم بەگ) دووچاری نا ئومێدی بووە سەبارەت بە ژیانی من (پاشان سوڵتان عبدالحمید وتی: لە داهاتوودا پەردەیەکی ڕەش دەدرێت بە سەر هەموو خزمەت و کارە باشەکانمدا کە پێشکەشی وڵات و ئوممەتی ئیسلامیم کردووە) لەم کاتەدا سوڵتان هۆن هۆن فرمێسك لە چاوەکانی دەهاتە خوارەوە.

بەڵام هاوسەرەکەی زۆر کەسێکی دامەزراو و هێمن و لە سەر خۆ بوو بەردەوام دڵخۆشی سوڵتانی دەدایەوە، هەمان کات هەستی بەوەش کردبوو، کە سوڵتان لە ئان و ساتی گیان کێشان دایە، لە بەر ئەوە داوای لە کوڕ و کچەکانی کرد وەك دوا جار چاویان بە باوکیان بکەوێت، پاش ئەوەی هەموویان لە دەوری سوڵتان کۆبوونەوە، پاشان سوڵتان داوای کوپێك قاوەی کرد، دواتر لە سەر جێگەکەی دانیشت و قومێك قاوەی خوارد، پێش ئەوەی قومی دووەم بخواتەوە سوڵتان کەوت بەسەر باڵی خێزانەکەیدا و گیانی پاکی بەرەو لای خوای پەروەردگار بەرز بوویەوە، ئیدی دەنگی هاوار و گریان کۆشکەکەی پڕکرد، ماتەم و گریان و خەم باڵی بە سەر کۆشکدا گرت، بەڵێ بەو شێوازە سوڵتان عبدالحمید بەرەو لای پەروەردگاری گەڕایەوە، کە بە درێژایی تەمەنی هەتا دەستەڵاتی لە دەستدا بوو، ساتێك گۆڕەپانەکەی چۆڵ نەکرد بوو بۆ دژمنانی ئیسلام، بەڵام چی بکەی لە هەڵویستی ئەو کەسە بێ وەفا و ناپاکانە کە سەر باری ئەو هەموو چاکانەی سوڵتان بەرامبەریان، مەخابن ئەوان لە بەرامبەر ئەو هەموو چاکانەی سوڵتاندا، بە کودەتا کردن بەسەریدا پاداشتیان دایەوە.

بەڵی بەو شێوازە سوڵتان عبدالحميد گيانی سپارد، پاشان (ڕاسەم بەگ) ی سەرۆکی پاسەوانەکان هاتە ژوورەوە و دواين سڵاوی ئاڕاستەی سوڵتان کرد، شايانی باسە سوڵتان عبدالحميد لە (١٠) ی شوباتی (١٩١٨) دا گيانی پاکی سپارد[١٥].

## سوڵتان عبدالحميد وهەڵوێستی لە بەرامبەر کێشەی فەلەستيندا :

پاش ئەوەی بە شێوەيەکی خێرا و بە کورتی ژيانی سوڵتان عبدالحميد مان خستە ڕوو، دەمانەوێت لێرەدا بە هەڵوێستی سوڵتان عبدالحميد ئاشناتان بکەين،لێرەدا بەوردی و بەکورتی هەڵويستی سوڵتان عبدالحميدتان بۆ ڕوون دەکەينەوە لەمەڕ کێشەی فەڵەستين، بەڵی هەڵوێستە توندەکانی سوڵتان سەبارەت بە کێشەی فەڵەستين و بەرپەرچ دانەوەی داواکاريە، يەك لە دوای يەکەکانی جولەکە هۆکاری سەرەکی بوون بۆ دوور خستنەوەی سوڵتان لە کورسی فەرمان ڕەوايی.

بەڵی! ئەگەر سوڵتان عبدالحميد هيچيشی نەکردبێت بۆ ئيسلام و ئوممەتی ئيسلامی و خاك و گەلی فەڵەستين، هەر ئەو هەڵوێستانەی

(١٥) گۆڤاری عەرەبی ژمارە (٣٢٩)، ڕەجەبی (١٤٠٦) بەرامبەر نيسانی (١٩٨٦).

بەسە تا شانازی پێوە بکرێت، لەوەی کە ئامادە نەبوو تەنانەت یەك بست خاکی فەلّەستین بداتە جولەکەکان، کە چەندین جار بە فەرمی نوێنەری خۆیان ناردە لای سولّتان هەتا بە پارە و مالّی دونیا قەناعەت بە سولّتان بکەن بۆ ئەوەی بەشێك لە خاکی فەلّەستینیان بداتیّ!!!.

جولەکە نوێنەرە ماسۆنیەکەی خۆیان نارد کە (قرەصو) بوو، داوای ئەوەی کرد کە ڕێگەی بدەن هەتا چاوی بە سولّتان عبدالحمید بکەوێت بۆ ئەوەی داواکەی بخاتە ڕوو پاشان لە ڕێی (کەمال بەگەوە) چاوپێکەوتنی (قرەصو) لە گەلّ سولّتان ڕێکخرا، بە ئامادە بوونی یەکێك لە هاوکارەکانی سولّتان کە عارف بەگ بوو، پاشان (قرەصو) بە سولّتانی ڕاگەیاند : من وەك نوێنەری کۆمەلّەی ماسۆنی هاتووم، تا بە جەنابەت ڕابگەیەنم بەوەی کە بڕی پێنج ملیۆن لیرەی ئالّتونیم لێ وەربگریت وەك دیار ییەك کە تایبەتە بە خۆت و مافی کەسی پێوە نیە، وە بڕی سەد ملیۆنی ترم هێناوە کە بە قەرزی بێ زیادە خستنە سەر دەیدەینە دەولّەت، کە ماوەی قەرزەکە سەد سالّە، (پێویستە ئاماژە بەوە بدەین کە لەو ساتەدا دەولّەتی ئیسلامی ئەوەندە هەژارو قەرزار بوو، تەنانەت موحتاجی یەك لیرەش بووە!) پاشان (قرەصو) لە بەرامبەر ئەم دیارییانەی کە پێشکەشی سولّتان و خەزێنەی

دەوڵەتی دەکات وتی : داوات لێ دەکەین کە ڕێگەمان پێ بدەیت تا لە فەڵەستین دا چەند ئیمتیازاتێکمان هەبێت، یەکێك لەو شتانەی جووەکان دەیان ویست لەخاکی فەڵەستیندا بیکەن و یەکەم نەخشەیان بۆ دانابوو، بریتی بوو لەکردنەوەی زانکۆیەك لەخاکی فەڵەستیندا بۆئەوەی ڕۆشنبیرانی پێ خڕبکەنەوە و،هەتا لێرەوە بیری داگیر کارانەی خۆیانی پەرە پێ بدەن.

پاشان سوڵتان عبدالحمید ڕووی کردە هاوکارەکەی و پێی وت : ئایا تۆ دەزانیت ئەم بەرازە داوای چی دەکات! ؟ پاشان هاوکارەکەی، خۆی خست بە سەر قاچی سوڵتاندا و سوێندی خوارد بەوەی کە نەیزانیوە ئەو جولەکەیە بۆ ئەمە هاتووە، دواتر سوڵتان عبدالحمید بە ڕوویەکی گرژەوە سەیری (قرەصو) ی کردوو پێی ووت : ڕووت لێم وەرگێڕە ئەی ناپاکی سوك! ! پاشان دەست بە جێ (قرەصو) سواری کەشتییەك بوو کە بەرەو ئیتاڵیا گەشتی دەکرد، دواتر لە ئیتاڵیاوە نامەیەکی تری بۆ سوڵتان عبدالحمید هێنا کە تیایدا هاتووە : تۆ داواکاریەکەمانت بەرپەرچ دایەوە، لە داهاتوودا بە گیانی خۆت و دەستەڵات و وڵاتەکەتەوە باجی ئەم داواکاریەمان دەدەیت کە بەرپەرچت دایەوە! .

هەروەها جولەکە بۆ جاری دووەم هەوڵیاندا کە سوڵتان عبدالحمید ڕازی بکەن تا ڕێگەیان بدات بەرە و فەلەستین کۆچ بکەن، بۆ ئەم مەبەستە لە ساڵی (١٨٩٧) دا (هرتزل) ی گەورە بەرپرسی زایۆنیەکان بە یاوەری (حاخام، موسا) سەردانی سوڵتان عبدالحمیدیان کرد لە کۆشکی (یەڵدز)، ناوبراو پاش ئەوەی زۆر بەگەرمی سوپاسی دەوڵەتی عوسمانی کرد لە بەرامبەر هەوڵەکانی دەوڵەتدا، لە مەڕ پاراستنی سەلامەتی گیانی جولەکەکانی ژێر دەستەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی دا! دواتر داوای لە سوڵتان عبدالحمید کرد کە ڕێگە بە جولەکەکان بدات تا مافی ئەوەیان هەبێت لە فەلەستیندا نیشتەجێ بن و بتوانن وەبەرهێنان لە فەلەستین دا بکەن! پاشان سوڵتان دەم و چاوی گرژ کردو وتی: من وای دەبینم کە برا جولەکەکانتان، ژیانیان زۆر لە خۆشی و هێمنیدایە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو چاوپۆشی و پارێزگاریەی کە لە لایەن دەوڵەتی عوسمانی و خودی خۆم و باوباپیرە دەستەڵاتدارەکانمانەوە پێشکەشی جولەکەکانی ژێر دەستەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی کراوە و، بەردەوام هەوڵمانداوە پارێزگاری لە ژیان و شەرەف و کەرامەتی جولەکەکان بکەین؟ پاشان سوڵتان بە حاخام موسای وت: چی وای لێ کردوون کە پەردە بە سەر کارە چاکەکانی دەوڵەتی ئیسلامیدا بدەن؟

ئەويش لە وەڵامدا وتى : استغفر الله گەورەم ئێمە هيچ گلەييەكمان لە جەنابت و دەوڵەتى ئيسلامى نيە ! بەڵكو خوازيارى ئەوەين كە جولەكە پەرش و بڵاوەكان لە جيهاندا كۆبكەينەوە و نيشتيمانێكيان بۆ دروست بكەين، ئەگەر ئەم كارەمان بۆ بكەيت هەتا هەتايە نزاى خێرت بۆ دەكەين، جەنابى سوڵتان عبدالحميد !

پاشان سوڵتان پێى راگەياند : ئێوەى جولەكە لە هەموو هاونيشتيمانيانى ئەم وڵاتە زياتر سوودمەند بوون، ئايا حاخام ئەمە شتێكى راستەقينە نيە ؟ !

ماوەيەك بێ دەنگيەكى قوڵ باڵى بە سەر ئامادەبواندا كێشا، پاشان هرتزل ويستى ڕاستەوخۆ بابەتەكە بە سوڵتان بگەيەنێت و ڕايگەياند : بۆ نمونە ئەگەر گەورەمان (سوڵتان عبدالحميد) ڕەزامەندى دەربېڕێت بەوەى هەندێك لە زەوى فەڵەستينمان پێ بفرۆشێت (مەبەستى ناوبرا و ئەو زەويانەبوو كە مافى خاوەنداريەتى ميرى و خەڵكيان پێوە نيە، واتە زەوى دەرەوەى شارەكان) ناوبراو داواى لە سوڵتان كرد كە بە ئارەزووى خۆى نرخەكان ديارى بكات !

پاشان سوڵتان تورە بوو ڕايگەياند (خاكى نيشتيمان بە هيچ جۆرێك نافرۆشرێت، ئەو وڵاتەى كە بە خوێن پارێزگارى لێكراوە

نافرۆشـرێت مەگـەر لـە بەرامبـەر دا بـە جـەنگ و خـوێن لێمـانی داگیربکەن!).

بەو شێوەیە بەردەوام جولەکەکان هەوڵیان دەدا سوڵتان عبدالحمید ڕازی بکەن،هەتا بە هەر شێوازێك بووە لە بەشێك لـە خـاکی فەڵەسـتین خوش ببێت و ببداتە جولەکـە، هـەروەك نمونـەی ئـەوەش لـە گۆڤـاری (المشرق) ی ماسۆنیدا هاتووەو لە لاپەڕەی (١٠٩٤) ی بەرگی دەهەمـدا کە لە ساڵی (١٨٩٩) دا دەرچوەو تیایدا دەڵێت: لە کاتێکدا کە (غوش) باڵیۆزی ئیسرائیلی بووە لە پاکستان پێشنیاری ئەوەی خستە بـەردەم حکومەتی سوننی مەزهەب کە ناوچەکانی (جەلعاد و هەروەها ناوچـەی موئابی ئەردەنی) بفرۆشێت بە جولەکە، ناوبراو داوای ئـەوەی کـرد کـە بە مەساحەی شەش سەد هەزار هێکتار زەوی ئەو ناوچانە بفرۆشێت بە جولەکـە، لـە بەرارمبـەردا ڕێژەیـەکی زۆر پـارە بـدرێت بـە سـوڵتان عبدالحمید کە لە چەند ملیۆن فرانك کەمتر نەبێت! !

بـەو شـێوازە دەوڵـەتی سـوننی مەزهـەبیش وەڵامـی داخوازیـەکانی جولەکەکانی نەدایەوە و هیواو ئـارەزووی جولەکـە دەوڵەمەنـدەکان بـە بادا درا، ئەوان خوازیـاری ئـەوە بـوون کـە ئاسـان کـاری بکـەن لـە بـۆ

دروست کردنی نیشتیمانێکی نەتەوەیی بۆ خۆیان و نەوەکانیان، بۆ ئەوەی دەوڵەتێکی سەربەخۆ دروست بکەن لە ناو جەرگەی زەوییە پیرۆزەکان دا کە قودس و ناوچەکانی فەلەستین دەگرێتەوە، هەروەك چۆن لە پێش مەسیح دا لەو ناوچانەدا بونیان هەبووە.

لە کتێبی یادەوەرییەکانی هرتزل دا کە مێژووەکەی بۆ ساڵی(١٩٠١) دەگەڕێتەوە، تیایدا ئاماژە بە بەر پەرچ دانەوەی داواکەی دەکات لە لایەن سوڵتان عبدالحمیدەوە، کە تیایدا هاتووە: سوڵتان عبدالحمید بە گاڵتەجارییەوە بە هرتزلی ڕاگەیاندووە : ئامۆژگاری هرتزل بکەن سەبارەت بەم بابەتەی کە بۆی هاتووە با ڕێ وشوێنی پێویستی تری بۆ بگرێتەبەر! من ناتوانم چاو پۆشی تەنانەت لە بستێکی خاکی فەلەستین بکەم، چونکە ئەم خاکە موڵکی من نیە! بەڵکو موڵکی گەلەکەمە لە فەلەستین، گەلەکەم بە بەردەوامی لە پێناو ئەم خاکەدا خەبات و کۆششی کردووە و بە خوێن پارێزگارییان لێی کردووە، ئامۆژگاری جولەکە دەکەم بەوەی خۆیان بپارێزن.... ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان حکومەت و دەستەڵاتەکەم لە ناو چوو، ئەوا ئەو کات بێ گومان جولەکە دەتوانن خاکی فەلەستین بە خۆڕایی و بە بێ بەرامبەر داگیر

بکەن!! بەڵام تا من زیندوو بم و دڵم لێ بدات و گیان لە جەستەمدا بێت هەرگیز ئەوە قبوڵ ناکەم خاکی فەلەستین دابڕێت و جیابکرێتەوە لە دەستەڵات و ئیمپراتۆریەتەکەم، ئەوە شتێکە هەرگیز ناهێڵم بێتەدی.

بەڵێ جولەکە و زایۆنیەکان بەردەوام لە هەوڵدا بوون بۆ ئەوەی بتوانن ڕەزامەندی بەدەست بهێنن و لە فەلەستیندا جێگیر بن و چالاکییان هەبێت، یان بە لایەنی کەمەوە بتوانن بەشێك لە خاکی فەلەستین بکڕن، لە بەر ئەوە بەبەردەوامی نوێنەریان دەنارده لای سوڵتان عبدالحمید.

بۆ هەمان مەبەست و لە ساڵی (١٩٠٢) دا وەفدێکی سێ کەسی جولەکە بە سەردانێك خۆیان گەیاندە لای سوڵتان عبدالحمید، پاش ئەوەی ئەو وەفدە لە لایەن تەحسین[١٦] پاشاوە پێشوازییان لێ کرا و داوای لێ کردن کە مەبەستی هاتنیان بۆ لای سوڵتان بخەنە ڕوو، بەڵام وەفدەکە هەر پێداگرییان لەوە دەکرد مەبەستەکەیان لە تەحسین پاشا

---

(١٦) تەحسین پاشا لەو کاتەدا وەك سەرۆکی یاریدە دەرەکانی سوڵتان عبدالحمید بووە، یان ئەوەی ئەمڕۆ پێی دەوترێت ڕاوێژکاری بەرپرس و سەرۆکەکان .

بشارنەوە و دەیان ویست ڕاستەوخۆ چاویان بە سولتان عبدالحمید بکەوێت و لە لای خۆی مەبەستەکە بخەنە ڕوو، بەلاّم تەحسین پاشا بەڵێنی پێ دان داواکەیان وەکو خۆی بگەیەنێتە سوڵتان، لە بەر ئەوە داوا لە وەڤدەکە کرا داخوازیەکانیان بکەنە نامەیەك هەتا وەك خۆی بگەیەنرێتە سوڵتان.

لەو نامەیەدا هاتبوو کە جولەکە ئامادەیی یان تیادایە بۆ جێ بە جێ کردنی ئەم خاڵانە:

(١) بژاردنی هەموو قەرزەکانی دەوڵەتی عوسمانی.

(٢) دروست کردنی کەشتی گەلێکی سەربازی بە مەبەستی پاراستن و بەرگری کردن لە دەوڵەتی عوسمانی.

(٣) پێدانی قەرز بە بڕی (٣٥) ملیۆن لیرەی ئاڵتونی بە دەوڵەتی عوسمانی بێ ئەوەی هیچ زیادەیەکی بخرێتە سەر، ئەمەش لە پێناوی بوژاندنەوەی بواری دارایی دەوڵەت و گەشەپێدانی بەرهەمەکانیدا.

بەلاّم لە بەرامبەر ئەم سێ خاڵەدا جولەکە داواکاری و ئامانجی خۆیان دەخەنە ڕوو کە ئەویش بریتیە لە:

أ- ڕێگە بە جولەکەکان بدرێت تا ئازاد بن بەوەی کە چ ڕۆژێك ئارەزوویان کرد سەردانی فەلەستین بکەن.

ب- ڕێگە بە جولەکەکان بدرێت بە دروست کردنی کۆمەڵگەیەك لە نزیك قودسی پیرۆزەوە، ئەمەش تا ببێتە جێگەی مانەوە و حەوانەوەی ئەو جولەکانەی کە بۆ سەردان و گەشت دێنە ناوخاکی فەڵەستین.

ئەم داخوازیانەی وەفدە سێ کەسیەکەی جولەکە، لە لایەن تەحسین پاشاوە گەیەنرایە سوڵتان عبدالحمید، پاشان تەحسین پاشا بەم شێوەیە وەڵامی جولەکەکانی دایەوە کە لە لایەن سوڵتان عبدالحمیدوە ئاڕاستەیان کرابوو :

(١) قەرزەکانی دەوڵەتی عوسمانی ئەمە ناتەواوی و عەیبێك نیە بۆ دەوڵەت، چونکە دەوڵەتانی وەکو فەڕەنساش دووچاری قەرزاری بوونەتەوە، ئەمە بە هیچ شێوەیەك زیان بە ناوبانگی دەوڵەتی عوسمانی ناگەیەنێت.

(٢) قودسی پیرۆز یەکەمین جار لە لایەن عومەری کوڕی خەتتابەوە فەتح کراوە، من هەرگیز ئامادەیی ئەوەم تیانیە ئەو شورەییە مێژووییە لە ئەستۆ بگرم بەوەی فەڵەستین و قودس بفرۆشم بە جولەکە، ئەوە بە خیانەت دەزانم لە بەرامبەر ئەو سپاردەیەی خراوەتە سەر شانم، من ڕاسپێردراوم هەتا ببمە پارێزەری خاك و سەروەت و سامان و ناموسی مسوڵمانان.؟

(٣) بە جولەکەکانی ڕاگەیاند کە پارە و سامانی خۆتان بۆ خۆتان، دەوڵەتی ئیسلامی ئامادەیی ئەوەی تیانیە لە سەنگەرێکدا بەرگری بکات کە ئەو سەنگەرە بە پارەی دوژمنانی بونیات نرابێت!؟.

پاشان سوڵتان لە کۆتاییدا داوای ئەوەی کرد بوو، دەستبەجێ ئەو وەفدە بکرێنە دەرەوە و ئیدی بە هیچ شێوەیەك ڕێگەیان پێ نەدرێت بۆ ئەو مەبەستە بێنە ناو کۆشکی سوڵتانەوە...

لە کۆتاییدا پێویستە ئاماژە بە یادەوەریەکانی هرتزل بدەین سەبارەت بە هەوڵە یەك لە دوای یەکەکانی هرتزل هەتا ڕەزامەندی سوڵتان وەربگرێت بۆ نیشتەجێ کردنی جولەکە لەخاکی فەڵەستین دا، ناوبراوبۆ ئەو مەبەستە دووجار توانیویەتی چاوپێکەوتن لە گەڵ سوڵتان عبدالحمید دا بکات.

وە هەروەها لە ڕێگەی شا (غلیوم)ەوە سەردانی دەوڵەتی عوسمانی کردووە، بەڕەسمی ئەم داواکاریەی ئاڕاستەی سوڵتان عبدالحمید کرد..

هەروەها هرتزل بۆ ئەم مەبەستە پەیوەندی کردووە بە وەزیری موستەعمەراتی بەریتانیاو پاشای ئیتاڵیاو قەیسەری ڕوسیاو ڤاتیکانەوە، هەمان کات پەیوەندی بە ئەمریکا و چەندین کەسایەتی و

دەوڵـەتی تـرەوە کـردووە، ئەمـەش لـە پێنـاو قایـل کردنـی سـوڵتان عبدالحمید، هەتا لە ڕێی ئەو پاشا و وڵاتانەوە سوڵتان ڕازی بکرێـت بـۆ ئەوەی ڕێگە بە جولەکەکان بدات بـەرەو فەڵەسـتین کـۆچ بکـەن و، بـە یەکجاری لەو خاکەدا بمێننەوە، بەڵام سەرئەنجام هـەموو هەوڵـەکانیان بێ ئەنجام مانەوە!..

سـوڵتان عبدالحمیـد هــەر بەوەنــدە وازی نــەهێنا داخــوازی و داواکاریەکانی جولەکە بەرپەرچ بداتەوە، کـە سـەبارەت بـە فەڵەسـتین ئاڕاسـتەی سـوڵتانیان کردبـوو، بـەڵکو ئامـاژەی بـە مەترسـیەکانی جوڵانەوەی زایۆنیزم داو، هۆشداریدا لە مـەڕ مەترسی و هەڕەشـەکانی ئەو جوڵانەوەیە بـۆ سـەر دەوڵـەتی ئیسلامی بـە گشتی و ناوچـەکانی فەڵەستین بە تایبەتی، بۆ ئەو مەبەسـتەو لەپانزەی تـشرینی یەکـەمی ساڵی (١٩٠٠) دا بەیاننامەیـەکی بــە ژمــارە (٢٤٠٩) بڵاوکـردەوە و ئاڕاسـتەی هـەموو ویلایـەت و ناوچـەکانی ژێـر دەسـتەڵاتی دەوڵـەتی عوسمـانی کـرد، سـەبارەت بـە ڕێگـە گـرتن لـە نیـشتەجێ بـوونی جولەکەکان بە هەمیشەیی لە فەڵەستیندا، هەروەها ئەو نوسـراوە هـەر جۆرە کۆچ کردنێکی بـە کۆمـەڵی جولەکـەی بـۆ ناوچـەکانی دەوڵـەتی عوسمانی و بەتایبەت فەڵەستین قەدەغە کرد.

هـەروەك نوسـراوەکە داوای ئەوەیـشی کردبـوو کـە ڕێگـە بـە جولەکـەکان نـەدرێت سـێ مـانگ زیـاتر لـە فەڵەسـتین دا بمێننـەوە، تەنانەت سوڵتان عبدالحمید پـێش دەسـت پـێ کردنـی جموجوڵـەکانی هرتـزل، دام و دەزگاکـانی دەوڵـەتی لـە مەترسـیەکانی بزووتنـەوەی زایۆنی ئاگادار کردبوەوە و، چـەندین بڕیاریـشی لـەو بـارەوە دەرکـردو داوای لە کارمەندانی میری کرد ئەو ئەرکەی لـەم ڕوانگەیـەوە دەخرێتـە سەرشانیان بە وردی جێ بە جێ ی بکـەن، هـەر ئـەو کـات و لـە سـاڵی (١٩٠٢) دا وەزارەتـی نـاوخۆی دەوڵـەتی عوسمـانی، ئـەو نوسـراوەی ئاڕاستەی هەموو ویلایەتەکانی دەوڵەت کرد و تیایدا هاتووە:

هـەروەك سـوور بـوونی خۆمـان ڕاگەیانـدووە سـەبارەت بـە قەدەغەکردنی هاتنە ناوەوەی جووەکان بۆ ناو خاکی فەڵەستین، بەڵام فەرمانبەران سستی لە جێ بـە جـێ کردنـی ئـەم بڕیـارە دا دەنـوێنن، جووەکان بە بیـانوی گەشـت کـردن دێنـە قـودس و پاشـان نیشتەجێ دەبن... مانەوەی ئەوجووانە بە هیچ جۆرێك لە جۆرەکان دروست نیـە، فەرمان ڕەوایانی دەوڵـەت بـەر پرسیارن لـەوەی کـە دەبێـت چـی لـە تواناياندايە بیخەنە گـەڕ لـە پێنـاو بـە وردی جـێ بـە جـێ کردنـی ئـەم بڕیارە دا.

بە هیچ شێوەیەك نابێت ڕێگەی مانەوەی هەمیشەیی بدەنە جولەکەکان،شیاوی ئاماژەیە ئەم بڕیارە ڕێگری لەو جولەکانە ناکات کە بە تاك یان بە کۆمەڵ دەیانەوێت بە گەشتێکی کاتی سەردانی ناوچە پیرۆزەکانی قودس و فەڵەستین بکەن! بەڵام لە هەمان کاتدا ڕێگەیان پێ نادات بەبەردەوامی لەو ناوچانەدا جێگیر ببن، پێویستە لەم بارەیەوە (تعهد) پەیمان لەو قونسولگەریانە وەربگیرێت کە جولەکەکانی لێوە هاتوون.

ئەم بڕیارە لە ژێر ڕۆشنایی فەرمانەکانی شورا و ئەنجومەنی وەزیراندا دەرچووە.

هەموو کات جولەکە داواکاریەکانی خۆیان دوور لە گیانی جەنگ و داگیرکاری و توندوتیژی داوا کردووە، ئەمەش زیاتر لە فێڵێکی ئەو گەلە فێڵبازە دەچێت بۆ گەیشتن بە ئامانجە گڵاوەکانیان لەوانەش : ئامادەیی دەربڕینی جولەکە بۆ یارمەتی دانی سوڵتان عبدالحمید لە ڕوانگەی بەهێز کردنی سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی لە گەڵ وڵاتانی ئەورووپادا، یان دروست کردنی کەشتی گەلێکی سەربازی بۆ پارێزگاری کردن لە دەوڵەتی عوسمانی، یاخود داواکاری بۆ دامەزراندنی زانکۆیەکی جولەکە لە قودس دا، جولەکە داوای ئەوەیان دەکرد کە بەشێك لە خاکی فەڵەستینیان پێ بفرۆشرێت بە هەر نرخێك بووە و

پاشان خۆیان بنیاتی بنێن، یان ئامادەیی دەربڕینیان بۆ پێدانی قەرزی بێ زیادە بە دەوڵەتی عوسمانی، یاخود بەڵێن دانی جولەکە بۆ بژاردنی قەرزەکانی دەوڵەتی عوسمانی کە لەو کاتەدا دەوڵەت نوقمی قەرزارییەکی زۆر ببوو، ئەمە و چەندین پاداشت و تەماع خرایە بەردەم سوڵتان عبدالحمید بۆ ئەوەی لە بەرامبەردا بە داخوازیەکانی جولەکە ڕازی بێت کە خۆی لە کۆچ کردنیان دا دەبینێتەوە بۆ فەڵەستین.

لە کاتێکدا ئەم پاداشت و مادانە خرانە بەردەم سوڵتان عبدالحمید کە دەوڵەتی عوسمانی پێویستی بە کەمترین یارمەتی هەبوو، دام و دەزگاکانی دەوڵەت بە دەست نەبوونی داراییەوە دەیان ناڵاند، هەژاری، نەخۆشی، نەخوێندەواری... هتد لە ناو گەلدا پەرەی سەندبوو، بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا سوڵتان عبدالحمید بە پشتیوانی خوای گەورەوە و بە دان بە خۆگرتن و ئارام گری گەلانی موسڵمان لە سەر ئازار و ناڕەحەتیەکانیان، بەردەوام بە توندی لە بەرامبەر ئەم داوایەی جولەکەکان دا وەستاوەتەوە و بە نەخێر وەڵامی داونەتەوە.

ئەمەش زیاتر لەو نامەیەی سوڵتان دا دەردەکەوێت کە ئاراستەی شێخ (محمود ئەفەندی ئەبی شامات) ی کردووە کە ناوبراو شێخی تەریقەتی شازلی یە لە دیمەشق دا، لە نامەکەی سوڵتاندا هاتووە : لە پاش ئەم پێشەکیە ئەوە دەخەمە ڕوو بۆ جەنابت و هەموو ئەو

کەسانەی کە هاووێنەی جەنابتن، هەروەها بۆ هەموو کەسە بیرمەند و تێگەیشتووەکانی دەوروبەرت، کە ئەویش ئەم بابەتە گرنگەیە و وەکو ئەمانەتێکی مێژووییە لە سەر شانم، من واز لە خەلافەتی ئیسلامی ناهێنم بە هۆی چەند هۆکارێکەوە بێجگە لەوەی من بە هۆی تەنگ پێ هەڵچنینمەوە لە لایەن بەرپرسانی کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقیەوەو هەڕەشە و گوڕەشەکانی ئەوان ناچارم دەکەن و لە سەرمی پێویست دەکەن،کە دوا جار واز لە خەلافەت بهێنم.

ئەم کۆمەڵەی ئیتیحادیانە زۆر پێداگری لە سەر ئەوەی دەکەن، من ڕەزامەندی دەربڕم لە سەر دامەزراندنی نیشتیمانێکی نەتەوەیی بۆ جولەکە لە فەڵەستیندا، لە گەڵ ئەوەدا ئەوان زۆر پێداگری لە سەر ئەم داواکاریە نابەجێیەدەکەن، منیش بە شێوەیەکی یەکجاری دژی ئەم داوایەی جولەکەکان وەستاوم و بە هیچ شێوەیەك داوایەکی ئەوتۆ قبوڵ ناکەم، پاشان جولەکە کاتێ هەستیان کرد داواکەیان جێ بە جێ ناکەم، بەڵێنی ئەوەیان پێدام کە (١٥٠) ملیۆن لیرەی ئالتونیم بدەنێ وەك بەرتیلێك لە بەرامبەر پێدانی بەشێك لە خاکی فەڵەستین بە جولەکە، دووبارە ئەم داواکاریەشم بەرپەرچ دانەوە، بەم شێوەیە و بە شێوەیەکی ڕەسمی وەڵامم دانەوە و پێم ڕاگەیاندن: نەك (١٥٠) ملیۆن لیرەی زێڕ تەنانەت ئەگەر هەموو دونیا هی ئێوە بێت و بمدەنێ، لە

بەرامبەر ئەوەدا کە بەشێك لە خاکی فەڵەستینتان بدەمێ ئەوا داواکەتان بەرپەرچ دەدەمەوە، من زیاد لە سی ساڵە بە دڵسۆزییەوە خزمەتی میللەت و ئوممەتی (ﷺ) دەکەم، من هیچ کات نەبومەتە هۆکاری ڕەش کردنەوەی لاپەڕەکانی مێژووی مسوڵمانان و باو باپیرانمدا لە دەستەڵات داران و خەلیفەکانی دەوڵەتی عوسمانی، لە بەر ئەوە بە هیچ شێوەیەك داواکەتان قبولْ ناکەم.

لە پاش ئەوەی بەو شێوازە بەرپەرچی جولەکەکانم دایەوە، ئیدی پێکهاتن لە سەر دوور خستنەوەم لە کورسی خەلافەت و، پێیان ڕاگەیاندم بەوەی کە دوورم دەخەنەوە بۆ (سەرانیك) منیش پێشوازیم لەم هەنگاوەیان کرد، لە کارلابردن و دوور خستنەوەم بە لاوە زۆر باشتر بوو لەوەی کە ئەو شەرمەزاریە مێژووییە بهێنم بە سەر خۆمدا کە ئەویش فرۆشتنی خاکی فەلەستین بوو بە جولەکە.

لە بەر ئەوە من زۆر سوپاس و ستایشی خوای پەروەردگار دەکەم کە ئەوەم قبولْ نەکرد، دەوڵەتی عوسمانی و جیهانی ئیسلامی بخەمە ژێر باری کارێکی قێزەون و خراپ و نەویستراوەوە، کە ئەویش داواکاریە یەك لە دوای یەکەکانی جولەکە بوو بەوەی کە ڕێگەیان پێ بدەم دەوڵەتی جولەکە لە ناوچە پیرۆزەکانی فەڵەستین دا دابمەزرێنن....

دووبــارەی دەكەمــەوە بــەردەوام ســوپاس و ستايــشی خــوای پەروەردگار دەكەم، من دلْنيام ئەم هەولْ و تێكۆشانەم ســەبارەت بـەم بابەتە گرنگە داومە بەسە بۆ شايەتی دان لە سەر ئەوەی كە من چـەند بـە تــەنگ كێـشەی فەلەسـتينەوە بـووم، بـەم شـێوەيەش كۆتـايی بـە نامەكەم دەهێنم...

والسلام عليكم ورحمه الله وبركاته

خزمەت گوزاری مسولْمانان

عبدالحميد كوڕی عبدالمجيد

بەلێ ئەمەيە هەلْوێستی سەربەرزانەی سولْتان عبدالحميد سـەبارەت بـە كێـشەی فەلەسـتين، ئـەم هەلْوێـستانەی نـاوبراو بوونـە هۆكـاری سەرەكی هەتا لە كورسـی حـوكم دووری بخەنـەوە، هـەروەك نوسـەری جولەكە (برنارد لويس) لە كتێبەكەيدا (دامەزرانـدنی توركيـای نـوێ) دا دەلێـت : بـرا ماسـۆنی و جولەكـەكانمان بـە نهێنـی و پێكـەوە كاريـان دەكرد بۆ لابردنـی سـولْتان عبدالحميـد لـە كورسـی حوكمـدا، هۆكـاری ئەمـەش بـۆ ئـەوە دەگەڕێتـەوە كـە سـولْتان عبدالحميـد زۆر دژايـەتی جولەكەی دەكرد و تەنانەت پێدانی يـەك بـست خـاكی فەلەسـتينی بـە جولەكە ڕەت كردەوە ! !

هەروەها دکتۆر (سیف الدین البستانی) دەڵێت : ماسۆنیەکان بە کرداری بەشداربوون لە لاوازکردنی دەستەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیداو، ڕۆڵ و کاریگەرییەکی زۆریان هەبوو لە شۆڕشی کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی لە لایەك، هەروەها بەشداری کردن و ڕۆڵ بینینیان لە شۆڕشی (٣١) ی مارتی (١٩٠٩) دا لە لایەکی ترەوە، ئەمەش لە ڕێی پشتگیری کردن و یارمەتی دانی شێخ و دەستەڵات دارە سادە و بێ هێز و ماف خوراوەکان، بە بیانوی ئەوەی کە یاسای یەکسانی لە نێوان ئاین و مەزهەبەکان جێ بە جێ دەکەن.

هەروها لە یادەروەریەکانی هرتزل دا هاتووە : هرتزل ڕۆڵێکی گەورەی بینیوە لە ناشیرین کردنی کەسایەتی سوڵتان عبدالحمید دا، هەمانکات هرتزل دەورێکی باڵای هەبووە لە دوورخستنەوەی سوڵتان لە کورسی فەرمان ڕەوایی، هەروەها سەرجەمی ئەو کتێبانەی کە دژی سوڵتان عبدالحمید نوسراون و، بە خراپە باسی کەسایەتی سوڵتان دەکەن، هەموو ئەو کتێبانە بە پیلان و نەخشە و پشتگیری جولەکە نوسراون، بەردەوام جولەکە هەولیان داوە کەسایەتی سوڵتان عبدالحمید بشکێنن، لە بەر ئەوە بە بێ شەرم کردن دەیان بوختان و درۆیان داوەتە پاڵ سوڵتان عبدالحمید، بوختانی ئەوتۆیان خستووەتە پاڵ ئەم سوڵتانە بەڕێزە بە خوێندنەوەی هەست بەشەرمەزاری یەکی

زۆر دەکەیت، ئەگەر بپرسین بۆچی جولەکە ئەو درۆشاخدارانە دەدەنە پاڵ سوڵتان؟ ئەوا بێ گومان وەڵامەکەشی زۆر ئاشکرایە؟ چونکە سوڵتان عبدالحمید ئامادە نەبووە تەنانەت لە بستێك خاکی فەڵەستین خۆش ببێت و بیداتە جولەکەکان.

وە لە ژمارەی (١٧٢) ی گۆڤاری فەتح دا کە لە (٥) ی جەمادی دووەمی (١٣٤٨) ی کۆچیدا دەرچوەو تیایدا هاتووە : کۆدەتاکەی ساڵی (١٩٠٨) ی تورکیا کۆدەتایەکی زایۆنی بوو، ئەمەش لە پێناو دوور خستنەوەی سوڵتان عبدالحمید لە کورسی فەرمان ڕەوایی، هەتا گۆڕەپانەکەیان بۆ چۆڵ بکرێت و دەست بدەنە جێ بە جێ کردنی نەخشە گڵاوەکانیان، یەکەم کاریشیان داگیرکردنی فەڵەستین و دروست کردنی دەوڵەتی ئیسرائیلە، بەڵێ کە دەڵێین زایۆنی دەستی هەبووە لە کۆدەتای ساڵی (١٩٠٨) دا بەڵگەمان بە دەستەوەیە ئەویش هەبوونی دوو گەورە بەرپرسی جولەکەیە لەوکۆدەتایەدا، یەکێك لەو کەسانە (قرەصو) ی جێگری گشتی زایۆنیزمە لە تورکیادا، هەروەك ناوبراو زانایەکی گەورەی جولەکەیە بەڵام ئەنوەر شەوکەت... هتد، ئەوانە کەسانێکی بێ نرخ بوون بە دەستی خۆیان مێژوویەکی ڕەش و بێزراویان بۆ خۆیان نەخشاندووە ! !

هەروەها لە جەنگی بەڵقاندا بە نەخشە و پیلانی جولەکە کە ئەو کات لەو سەردەمەدا جولەکەکان وەزارەتیان بەدەستەوە بوو، لە جیاتی ئەوەی چەك و تەقەمەنی بخەنە ناو گەنجینەی سەربازەکانی جەنگەوە، بە ئەنقەست دەچوون عەتر و سابونیان دەخستە ناو گەنجینە سەربازیەکانەوە و ڕەوانەی بەرەکانی شەڕیان دەکردن! ! کە ئەوە جەنگێك بوو جولەکەی لە پشتەوە بوو، جەنگی یەکەمی جیهانیش بە هەمان شێوە جەنگێك بوو لە لایەن جولەکەو زایۆنیزمەوە هەڵگیرسێنرا، هەروەها ئەنجامەکەشی لە خزمەت جولەکە و زایۆنیدا بوو؟ چونکە چەك بە بێ هەبوونی ماڵ و دارایی کاریگەری ئەوتۆی نیە، ئەوەندە بەسە بۆ جولەکە یەکێك لە دەسکەوتەکانیان کە پاش ئەو جەنگە بەدەستیان هێنا ئیمزاکردنی بەڵێنە شومەکەی بەلفۆڕ بوو! ! !

سوڵتان عبدالحمید سەبارەت بەو کەسانەی کە دووریان خستەوە لە خەلافەت دەڵێت (ئەوانە کۆمەڵێکی دووڕوو و سوك بوون، ئاین و نیشتیمانی خۆیان گۆڕی، بوونە هاوپەیمانی خاچ پەرستە دوژمنەکانمان و، دەستیان تێکەڵ کرد لە گەڵ بێ باوەڕاندا لە دژی خزم و خوێش و برائاینیەکانیان).

هەندێك لەو کەسانەی کە بەشدارییان لە کۆدەتاکەدا کردووە، لە سەر زاری خۆیان ئەوەیان ڕاگەیاندووە کە ئەوان بوونەتە قوربانی

نەخشە و فێڵی ماسۆنیەت و زایۆنیزم، ئەوە ئەنوەر پاشایە کە خۆی سەرۆکایەتی کۆدەتاکەی ساڵی (١٩٠٨) ی کردووە لە دژی خەلافەتی ئیسلامی و سوڵتان عبدالحمید کە بێ گومان ئەم کۆدەتاکردنە هۆکارێکی سەرەکی ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی بوو، ئەنوەر پاشا ئاماژە بە گفتوگۆیەکی نێوان خۆیی و جەمال پاشا دەکات، کە هەردووکیان ئەو هۆکارانەیان شی کردووەتەوە کە بوونەتە هۆی ڕمان و کەوتنی دەوڵەتی عوسمانی، پاشان پرسیار دەکات و دەڵێت (... ئایا جەمال دەزانی تاوانی ئێمە لەم ڕووەوە چییە؟) لە پاش هەڵکێشانی هەناسەیەکی پەشیمانی وتی : ئێمە سوڵتان عبدالحمیدمان نەناسیوە.... تەنها ئەوەندە ئەزانم کە ئێمە ئامێرێك بووین بە دەستی زایۆنیەکانەوە! !!؟ بەڵێ بێ گومان ئەمە ڕاستەقینەیەکی زۆر ڕون و ئاشکرایە بۆ ئەوانەی کە پەند وەردەگرن.

## بەرپەرچ دانەوەی هەموو ئەوگومان و درۆ و بوختانانەی کە لە دژی سوڵتان عبدالحمید هەڵبەستران:

جولەکە و زایۆنیزم و ماسۆنی و هاوشێوە بەکرێ گیراوەکانیان هیچ کەم و کورتی و نەنگی و ناتەواویەك نەماوە کە نەیدەنە پاڵ سوڵتان عبدالحمید، جا ئەو تۆمەتانە لە بواری فەرمان ڕەوایی سوڵتاندا بێت یان لە بوارەکانی تردا، هەوڵیان داوە و بەردەوام بوون لە دروست کردنی درۆ و بوختان لە دژی سوڵتان عبدالحمید، تەنانەت کەسایەتی سوڵتانیان بە شێوازێك وێنە کرد بوو وەك نیشانەی ستەم و زۆرداریی و دڵ رەقی و نەزانی وخۆ بەزلزانین و تاوانباری و دڕندەیی... هتد لە قەڵەمیان دەدا.

هەروەها سوڵتانیان بەوە تاوانبار دەکرد کە ماڵ و دارایی دەوڵەتی بەفیڕۆ داوە و لە بەرژەوەندی حەز و ئارەزووەکانی خۆیدا بەکاری هێناوە، هەروەك ناوبراویان بەوە تۆمەتبار دەکرد کە کەسێکی شەهوانی و ئارەزووبازە ! ! ! بە بڕوای دوژمنان سوڵتان عبدالحمید پیاوە سیخوڕەکانی خۆی لە هەموو شوێنێکدا پەرش و بڵاو کردبوەوە، بە شێوازێك کە برا متمانەی بە برای خۆی نەبووە و باوك متمانەی بە کوڕ و هاسەری خۆی نەبووە.

پاش ئەوەی کە دەوڵەتی عوسمانی و خودی سوڵتان دووچاری ڕوخان بونەوە، ئیدی لە لایەن دوژمنانەوە هێرشێکی ئیعلامی ناڕەوا و داخ لە دڵانە ڕووبەرووی سوڵتان عبدالحمید بوویەوە، ئامانجی سەرەکیان لێرەدا تەنها بریتی بوو لە شکاندنی کەسایەتی سوڵتان عبدالحمید.

بە هەمان شێوە زایۆنیزم و دەوڵەتانی ڕۆژئاوا بە هەموو شێوازێك و ئەوەی لە توانایاندا بوبێت لە بواری ڕۆژنامە و ڕادیۆ و هۆکارەکانی ڕاگەیاندندا کەمتەرخەمیان نەکردووە لە پەرەپێدانی و بازاڕ گەرم کردنی، بەو شێوازە دەیان تۆمەت و بوختانیان داوەتە پاڵ سوڵتان عبدالحمیدو باقی هەڵسوڕێنەران و کار بە دەستەکانی ئەو کاتەی پایتەختی موسڵمانان.

تەنانەت دوژمنە زایۆنی و ڕۆژئاواییەکان تۆمەتی ئەوتۆیان بۆ سوڵتان عبدالحمید دروست کردووە کە بە خوێندنەوە و گوێ گرتن بۆ ئەو قسە پڕوپوچ و بێ مانایانە مرۆڤ دووچاری شۆك و شەرمەزاری دەبێت، ئەوەی بەرچاو دەکەوێت دروست کردنی کۆمەڵە تۆمەتێکە بەوەی سوڵتان عبدالحمید کەسێکی ئارەزوو بازبووە؟ !بەبڕوای ئەو بەد ڕەوشتە بوختان چییانە سوڵتان لە کۆشکەکەیدا کەنیزەك و مێرد منداڵ و کەسی خەسێنراو.... هتد هەبون و چێژی لێ وەرگرتوون!

هەروەها ئاماژە بەوە دەكەن كە هەزارەها كەنیزەك و ئافرەت لە كۆشكەكەی سوڵتان عبدالحميد دا بوون لە هەموو جۆرە توێژو نەتەوە جیاجیاكانی (عەرەب، یۆنان، فارس، ئەفریقی، ئەرمەن، تورك) كە تەمەنیان لە نێوان دە بۆ حەڤدە ساڵ بووە ! ! !

هەروەك دوژمنان ئاماژە بەو درۆیەش دەكەن كە سوڵتان عبدالحميد هەموو ئەو كەنیزەك و ئافرەتانەی كە تەمەنیان لە حەڤدە ساڵ تێ پەڕی كردوە بە دیاری پێشكەشی كەسە نزیكەكانی خۆیی كردوون.

لەو درۆ زۆر گەورە و شاخدارانەی تر كە ئاڕاستەی سوڵتان عبدالحميدی دەكەن ئەوەبووە : گوایە سوڵتان لە سەر هەموو ئەو كەسانەی پێویست كردووە كە لە دەوروبەری خۆیدان و سودی لێ وەردەگرن كە(لێرەدا مەبەستیان وەزیر و كاربەدەست و فەرمانبەرانی دەوروبەری سوڵتان عبدالحميدە)، بەوەی بە زۆر لە سەر ئەو كەسانەی پێویست كردووە كە هەریەك لەوان دیاری یەك پێشكەشی سوڵتان بكات، ئەمەش بەبۆنەی وەرگرتنی پۆستی خەلافەتەوە بووە، بە پێی تۆمەتەكانی دوژمنان بێت هەموو ساڵێك و لە ساڵیادی بوون بە خەلیفەدا، ئەو دیاری یە پێشكەشی سوڵتان كراوە، لە گەڵ ئەوەدا كە ئەم دیارییە بە زۆر و ستەم سەپێنراوە لە لایەن خەلیفەوە بە سەر دارودەستەكەیدا، هەمان كات دیارییەكە مەرجیشی لە گەڵدا بووە،

پێویست بووە لە سەریان ئەو دیاریە کچێك بێت کە شووی نەکردبێت و دەستی بۆ نەبرا بێت و هەڵنەگیرا بێت... هتد، هەمان کات چەندین درۆ و بوختان و تۆمەتی تریان داوەتە پاڵ سولّتان عبدالحمید کە بە شێوەیەك مرۆڤی ژیر و هۆشیار دووچاری شۆك دەکات، چۆن ئەو کەسە بێ نرخانە توانیویانە ئەو چیرۆك و تۆمەتە ناڕاستانە، بدەنە پاڵ کەسایەتیەکی بەباوەڕو لەخواترسی وەك سوڵتان عبدالحمید ! !

دواجار بە پێویستم زانی ئەوەتان بخەمە پێش چاو کە نزیکەی (٢٥) ساڵ لەمەبەر نوسیومە، لە سەر زاری مێژوو نوسەکانەوە تۆمارم کردووە کە تیایدا هاتووە : هەندێك لە مێژوو نوس و نوسەرەکان سوڵتان عبدالحمیدیان بە (سوڵتانی سوور) ناوبردووە، مەبەستیان لەمەدا ئەوەیە کە سوڵتان عبدالحمید کەسێکی خوێن ڕێژ بووە، بە هۆی زۆری خوێن ڕێژیەکانی سوڵتانەوە ئەم ناوەیان بەسەردا سەپاندووە ! ! بە بڕوای ئەو مێژوو نوسانە، سوڵتان عبدالحمید دروشمی (الغایە تبرر الوسیلە) ی بەرزکردبویەوە ! دوژمنان سوڵتانیان بەوە تۆمەتبار کردووە ئەوانەی ئۆپۆزسیۆن و دژی ئەوبوون هەمووی خستونەتە ناو فسفۆرەوە، یان توندی بەندیخانەکانی کردوون، بە بڕوای دوژمنان سوڵتان هەزارەها کەسی لە ئاوی ئەو فسفۆرەدا نوقم کردووە، هەروەها سەدان کەسی بێ تاوانی لە ناو بەندیخانەکاندا لە

سێدارە داوە!! ئەمە هەمووی تۆمەتی دوژمنانە؟ من تەحدای هەموو دوژمنەکانی سوڵتان عبدالحمید دەکەم تەنها ناوی چەند کەسێکم بدەنێ وەك بەڵگە لەو هەزاران کەسەی کە لە لایەن سوڵتانەوە کوژراون، وەك ئەوان دەڵێن!!

هەروەك جولەکە و زایۆنیزمی جیهانی و ئەوانەیشی هاوشێوەی خۆیان بیردەکەنەوە تۆمەتی سەر سوڕهێنەری تریان خستوەتە پاڵ سوڵتان و هەندێك جار بەشێت و هەندێك جار بە خوێن مژو ئارەزوو بازوو.. هتد تۆمەتباریان کردووە؟!! هەروەك ئاماژە بەوە دەکەن کە سوڵتان عبدالحمید کۆشکێکی بۆ خۆی دروست کردووە کە (٣٦٦) ژووری تێدابووە، بە ئەندازەی ژمارەی ڕۆژەکانی ساڵ! وە لە هەموو ژورێك لەو ژورانەدا کەنیزەکێکی جوان هەبووە!! هەر شەوێك لەلای کەنیزەکێکیان ماوەتەوە لە یەکێك لەو ژورانەدا!! لێرەدا زایۆنیەکان درۆیەکی زۆر گەورە دروست دەکەن بەوەی کە لە ناو هەموو ژوورەکاندا ئاوێنەی تایبەت هەبووە، گوایە سوڵتان عبدالحمید چوبێتە هەر ژوورێکیانەوە دەستبەجێ لە هەموو ژوورەکاندا وێنەی سوڵتان عبدالحمید نیشان دراوە!! واتە هەرکاتێك سوڵتان عبدالحمید چوبێتە هەر ژوورێکیانەوە دەست بە جێ لە (٣٦٥) ژوورەکەی تریشدا وێنەی سوڵتانی نیشانداوە!! پاساوی ئەم درۆیەش بەوە دەهێننەوە کە

سولتان بەردەوام ترسی ئەوەی هەبووە کە لە لایەن دوژمنەوە بکوژرێت، بەبڕوای ئەوان ئەگەر لەو کاتەدا یەکێك نیازی کوشتنی سولتانی هەبوبێت ئیدی توانای ئەوەی نەبووە ئەو ژوورە دیاری بکات کە سولتانی تێدایە چونکە (٣٦٦) سولتان عبدالحمید بە وەهم لەو ژوورانەدا هەبوون، لە بەر ئەوە کابرای بکوژ توانای دۆزینەوەی سولتان عبدالحمیدی راستەقینەی نەبووە( ئاگاداربن ئەمانە کە باسمان کردن هەمووی بڕوای ئەوانە نەك من)!!؟

یەکێکی دی لەو درۆ گەورانەی دەیدەنە پاڵ سولتان عبدالحمید ئاماژە بەوە دەکەن کە سولتان عبدالحمید خواردنی دەستی کەسی نەخواردووە جگە لە خواردنی دەستی دایکی نەبێت، واتە بە بەردەوامی سولتان ئەو خواردنانەی خواردووە کە بە دەستی دایکی دروست کراون!! چونکە بە بڕوای گلاوی ئەوان سولتان لەوە ترساوە کە ژەهر خوارد بکرێت؟ لە ڕاستیدا ئەمەش درۆیەکی زۆر گەورەیە؟ چونکە سولتان عبدالحمید تەمەنی شەش ساڵان بووە دایکی کۆچی دوایی کردووە هەروەکو لە پێشەوەئاماژەمان پێدا!!!

ئێستا پێم خۆشە کە بەر پەرچی ئەو تۆمەت و بوختان و درۆییانە بدەمەوە کە دراونەتە پاڵ سولتان عبدالحمید من لێرەدا تەنها بەرپەرچی چەند تۆمەتێك دەدەمەوە، چونکە ئەگەر بتەوێت

بەرپەرچی هەموو ئەو بوختان و تۆمەتانە بدەیتەوە کە بۆ سوڵتان عبدالحمید دروست کراون ئەوا بۆ وەڵام دانەوە و بە درۆ خستنەوەی ئەو تۆمەتانە و سەلماندنی ڕاستیەکان پێویستت بە کاتێکی زۆرە.

من لێردا تەنها بەپەرچی چەند تۆمەتێك دەدەمەوە،ئەو تۆمەتانەش بەرپەرچ دەدەمەوە کەتیایدا ئاماژە بە فیڕۆدانی سامانی دەوڵەت دەکەن لە لایەن سوڵتان عبدالحمیدەوە، لەلایەن دوژمنەکانیەوە باس لەدابەش کردنی سامان و دارایی دەوڵەت دەکرێت بە سەر سیخوڕەکانی سوڵتان عبدالحمیددا!! هەوڵ دەدەین ئەم تۆمەتە بە توندی بەرپەرچ بدەینەوە، کە هاوڕێکانی و ئەوانەی لە دەوروپشتیدا بوون بە بەڵگەوە ئەم تۆمەتە و تۆمەتەکانی دی بە درۆ دەخەنەوە کە بە ناڕەوا و ستەم، دراونەتە پاڵ سوڵتان عبدالحمید...

## ئێستا هەندێ لەو تۆمەت و بووختانانە بە بەڵگەوە بەرپەرچ دەدینەوە :

**(١) بە فیرۆدانی سامان و دارایی دەوڵەت لە لایەن سوڵتان عبدالحمیدەوە :**

ئەوانەی بانگەشەی ئەوە دەکەن سـوڵتان عبدالحمیـد، سـامان و دارایـی دەوڵـەتی بـە فـیڕۆداوە، لـە خزمـەتی بەرژەوەندیـەکانی خۆیـدا خـەرجی کردووە، لە خواردن و خواردنەوەو پۆشاكو ئارەزوو... هتددا.

هەروەك نوسەری ئەڵمانی (جوبرت فون مبکـوش) ئامـاژە بـەوە دەکـات کە (ژمارەی چێشت لێنـەرەکانی نـاو کۆشـکی سـوڵتان عبدالحمیـد هەشـت سەد چێشت لێنەر بوون )!!

هـەروەها دکتـۆر (مـاوتلن) دووچـاری ناڕەحـەتی و مانـدوو بـونێکی زۆر بووە، لە کاتی لێکۆڵینەوە و بە دواچونەکانیدا سەبارەت بەم بابەتە، ناوبراو بەرپەرچـی هـەموو ئـەو تۆمەتانـەی داوەتـەوە کـە دراونەتـە پـاڵ سـوڵتان عبدالحمید لە کتێبەکەیدا (عبدالحمید ظل الله علی الأرض)[١٧].

---

(١٧) با خوێنەری خۆشەویـست وا گومـان نـەبات کـە دکتـۆرە ( مـاوتلن ) بـەرگری لـە سوڵتان عبدالحمید دەکات ! بەڵکو کتێبەکەی کۆمەڵێك هەڵەی مێژوویی تێدایە هەروەها دوور لە گیانی بێ لایەنی کتێبەکەی نوسیوە، وە دکتـۆرە مـاوتلن لـە کتێبەکەیـدا هـیچ جـۆرە پێـوەرێکی زانـستی و دادگـەری بـە کـار نـەهێناوە !! هـەمان کـات نـاوبرا و لـە پێشەکی کتێبەکەیدا دەڵێت : مەبەست لە نوسینەوەی ژیانی سوڵتان عبدالحمیـد زیـاتر توێژینەوەیەکـە و مەبەسـتی بـووە شـیکردنەوە بکـات بـۆ ژیـانی دوایـن فـەرمان ڕەواو دەستەڵات داری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە بێ گومان ئەو کەسەش سوڵتان عبدالحمیدە.

بەڵی لە ڕاستیدا گەورەیی و ڕێزی مرۆڤ لەوەدایە کە دوژمنەکەی شاهێدی بە چاکە بۆ بدات!!

دکتۆرە ماوتلن دەڵێت: بەردەوام سولّتان عبدالحمید پارێزەری ئابوری دەوڵەت بووە، تەنانەت ئەگەر لە سەر حسابی خۆیشی بوبێت، سولّتان بەردەوام عەبایەکی ڕەشی سادەی پۆشیوە کە هیچ جۆرە خشلّ و جوان کارییەکی پێوە نەبووە!! هەروەها سولّتان عبدالحمید بەردەوام داواکاری ئەوە بووە خواردنی سادەی بۆ ئامادە بکەن، لە سەوزە و هێلکە و بەرهەمە شیرەمەنیەکان، ناوبراو خەیاری بە شێوەی مەحشی خواردووە!! بەڵێ ئەوە خواردنی سولّتان عبدالحمیدە، بەلاّم خواردنەوەکەی کەمێك باشتر بووە، کە لە ئاوی شەکر و هەندێك بۆنی سوك دروست کراوە (لە شێوەی شەربەتدا) بەردەوام سولّتان عبدالحمید داوای ئەوەی کردووە کە خواردنێکی سادەی بۆ ئامادە بکرێت و زیادەڕەوی نەکرێت لە ئامادە کردنی خواردنی پاشایەتیدا، ئەمە لە کاتێکدایە کە خواردنی ژەمێکی پاشاکانی سەردەمی خۆی بەشی چەند گەڕەکێکی شاری قوستەنتینیەی دەکرد.

هەروەها سولّتان عبدالحمید بەردەوام ئەوەی بەرپەرچ داوەتەوە کە لە ئاهەنگی بەشودانی کچ و ئاهەنگی خەتەنەکردنی کوڕەکانیدا پارەیەکی زۆر خەرج بکرێت، کە لەو سەردەمەدا ئەم جۆرە

دابونەریتانە بوونیان هەبووە و بە سەدان هەزار جونەیهی لەو ئاهەنگانەدا خەرج کراوە.

سوڵتان عبدالحمید یەکەمین کەسی رۆژهەڵاتی بووە کە لە گرنگی پارە و سامان تێگەیشتووە، سامان و دارایی و ئابورییەکی توند و تۆڵی بەسەرچاوەی هێز و سەرکەوتن زانیوە لەو سەردەمەی خۆیدا.

هەروەك سوڵتان عبدالحمید هەمیشە جل و بە رگی سادەی لەبەر کردووە، هەروەها خواردن و خواردنەوەکانیشی زۆر سادە بوون و لە خواردنی کەسێکی فەرمان ڕەوا نەدەچوون، لە تەوازوع و زوهدەکەیدا لە لایەن ناحە زانیەوە بەکەسێکی ڕژد ناوبراوە! بێ گومان سوڵتان عبدالحمید زۆر دڵ خۆش دەبوو لە کاتێکدا بەرپرسە باڵاکانی دەوڵەتەکەی چاویان لە سوڵتان بکردایە لە خواردن و خواردنەوە و جل و بەرگ و دونیا بەکەم گرتندا، بەردەوام شانازی دەکرد بە دونیا بەکەم گرتنەوە و ئەم سیفەتەشی بە یەکێك لە ڕەوشتە جوانەکانی موسوڵمانان و ئاینی ئیسلام دەزانی!

سوڵتان عبدالحمید بەردەوام ڕەخنەی لەو بەرپرسانەی دەوڵەتەکەی دەگرت کە سامان و دارایی دەوڵەتیان بەفیرۆ دەدا و زیادەڕەوییان دەکرد لە جۆری خواردن و جۆری جل و بەرگدا، سوڵتان ئەم زیادەڕەویانەی بەرپرسانی دەوڵەتەکەی خۆی بە بارگرانی دەزانی

بۆ سەر وڵات و خەزێنەی مسوڵمانان لە بەر ئەوە بەردەوام ڕەخنەی ئاڕاستەی ئەو کەسانە دەکرد.

لە لایەکی تریشەوە سوڵتان عبدالحمید زۆر ناڕازی بوو سەبارەت بە زۆری ژمارەی ئەو فەرمانبەرانەی کە موچەی زۆر زۆر وەردەگرن (الرواتب الضخمة) ناوبراو لە گەڵ داد گەری کۆمەلایەتیدا بووە داوای ئەوەی کردووە کە جیاوازی نەبێت لە ناو موچەی فەرمانبەرانی میریدا، هەروەك ناوبراو دەڵێت (هەندێك تێبینیان هەیە لە سەر ئەوەی کە من عەبایەکی ڕەشی سادە دەپۆشم، من لەمەودوا زیاتر سوربونی خۆم دەردەبڕم کە لە گرنگترین ئاهەنگیش دا هەر ئەو عەبا سادەیە بپۆشم! ئاینەکەمان فەرمانمان پێ دەکات کە دادگەری و یەکسانی جێ بە جێ بکەین، لە سەر ئێمەش پێویستە کە ئاسان کاربین لە خواردن و خواردنەوە و جل و بەرگمان دا، جێی داخە کە ئەم بوارە گرنگی پێ نادرێت لە لایەن بەرپرسە باڵاکانی دەوڵەتانەوە، هەروەها وەرگرتنی ئەو موچە زۆرە لە لایەن گەورە فەرمانبەرانی دەوڵەتەوە شتێکی سەرسورهێنەرە، لە ناو حکومەتدا چل فەرمانڕەواو شەست وەزیر و سیانزە (ناظیر) و سەد و هەشتا وەزیری پلە (ممتاز) هەیە، هەروەها (٣٩٠) وەزیری پلە یەك هەیە، وە (٢١) یاوەری دیکە بە پلەی (پاشا) هەن، وە (١٢٥) یاوەری فەخری، هەروەها هەبوونی (٢١) یاوەری

ڕاستەقینە! ! کە ئەمانەش ژمارەیەکی یەکجار زۆرن، شتێکی ئاساییە کە ئێمە ناتوانین وەك پێشینان ژیان بەسەر بەرین کە ئەمە بۆ ئەم سەردەمە پێشکەوتووە زۆر قورسە، بەڵام لە هەمان کاتدا شتێکی زۆر باشە ئەگەر ژمارەی فەرمانبەرانمان کەم بکەینەوە! ؟ لە گەڵ ئەوەی کە من چەندین جار داوام کردووە موچە بە شێوەیەکی ڕێك و پێك و یەکسان بەسەر فەرمانبەراندا دابەش بکرێت؟ بەردەوام ئەوە داوا و ئاواتی من بووە، بەڵام بڕوا ناکەم بتوانم ئەم نەخۆشیە پیسە چارەسەر بکەم).

هەروەك سوڵتان عبدالحمید زۆر ڕقی دەبوویەوە لە ئیسراف و زیادەڕەوی! ! لە کاتێکدا سوڵتان عبدالحمید دەسەڵاتی گرتە دەست براکەی زیاد لە یەك ملیۆن لیرەی ئاڵتونی قەرزدار بوو، سوڵتان کە دەستەڵاتی گرتە دەست سەروەت و سامانەکەی لە سەد هەزار لیرەی ئاڵتونی تێپەڕی نەدەکرد، ئەمەش بە هەوڵ و کۆششی خۆی پەیدای کردبوو کە بەرهەمی چەندین ساڵی بوو؟ چونکە ناوبراو سەرگەرمی بازرگانی کردن بوو لە بواری کشتوکاڵدا.

بە درێژایی سی ساڵ زیاتر سوڵتان عبدالحمید فەرمان ڕەوا بوو، هیچ کاتێك دەستی درێژ نەکردووە بۆ خەزێنەی مسوڵمانان و لە بەرژەوەندی خۆیدا بە کاری بهێنێت، تەنانەت زۆرجار پارە و سامانی

خـۆی پێـشکەش بـە پـڕۆژە خزمەتگوزاریـەکانی وەك (نەخۆشـخانە، زانکۆ، مزگەوت... ) کردووە.

سوڵتان عبدالحميد (١٥٥٢) بینـای جۆراوجـۆری بـە پـارەو سـامانی تایبـەتی خـۆی بـۆ دەوڵـەت دروسـت کـردووە، کـە بـڕی تێـچونی ئـەو بینایانـە (٧٨٠١٢٩) لیـرەی ئـاڵتونی بـووە، هـەروەك نـاوبراو هاوکـاری پرۆژەی هێڵی ئاسنی (دیمەشق، حیجاز) ی کردووە بە سامانی تایبەتی خۆی، هەروەها بڕی (٣٢٠) هەزار لیرەی ئاڵتونی تری بەخشیوە.

هـەمان کـات و لـە جـەنگی یۆنانیـەکان دا کەلـە سـاڵی (١٨٩٧) دا ڕوویـدا، هـەموو خـەرجی و مەسـرەفی ئـەم جەنگـەی خستە ئەسـتۆی خـۆی، وە زۆربـەی کـات سـوڵتان عبدالحميـد بـە پارەوسـامانی خـۆی هاوکاری هەژار و کەم دەرامەتەکانی کردووە.

من نامەوێت بەڵگەی زیاتر بخەمـە ڕوو، سـەبارەت بـەوەی ئەوەنـدە سەروەت و سامانی خـۆی خـەرج کـردووە لـە پـڕۆژە جۆراوجۆرەکـانی دەوڵەتـدا، بـەردەوام نـاوبراو بـەبێ بەرامبـەر و لـە بـەرخاتری خـوای پـەروەردگار لـەم کارانەیدا بـەردەوام بـووە، بیرمـان نەچـێت سـوڵتان عبدالحميد ئەو سەروەت و سامانەی بە ڕێگای شەرعی و بە مانـدووبون

وەدەست خستووە، کەسێك بەو شێوازە خزمەتی میللەت و ژێر دەستەکانی بکات، بەدڵنیاییەوە ئەو کەسە بەتەنگ ماڵ و سامانی خۆیی و میللەتەکەیەوە بووە و خەم خۆریان بووە،بێ گومان سوڵتان عبدالحمید هیچ زیادەڕەوییەکی نەکردووە، پارەی میللەتی بە فیڕۆ نەداوە هەروەك دوژمنان و ناحەزان بانگەشەی بۆ دەکەن؟ بە دڵنیاییەوە پێچەوانەی ئەوە ڕاستەقینەیە ! لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێت : ئەگەر سوڵتان عبدالحمید کەسێکی زیادە ڕەو بووە و سامانو دارایی بە فیڕۆ داوە ! ئەی چۆن ئەو سەروەت و سامانەی کۆکردوەتەوە ! ! ئەمە لە لایەك لە لایەکی ترەوە ئەگەر ناوبراو کەسێکی زیادەڕەو بووە و پارە و سەروەت و سامانی تایبەتی خۆی بە فیڕۆداوە ئەگەر ئەمە بەو شێوازە بێت کە دوژمنەکانی دەڵێن، ئەوا بێ گومان لە پاش تەواوبوونی سەروەت و سامانی خۆی دەستی کردووە بە خەرج کردنی سامان و دارایی دەوڵەت! بەڵام ئەمە بە هیچ جۆرێك ڕووی نەداوە، سوڵتان عبدالحمید نەکەسێکی ڕژد بووە و نەکەسێکی ئەو تۆیش بووە کە سەروەت و سامانی خۆیی و دەوڵەت بە فیرۆبدات، ئەوە تۆمەتێکە و لە لایەن ناحەزانەوە بۆی دروست کراوە.

## (٢) بڵاوکردنەوەی سیخوڕ لە لایەن سوڵتان عبدالحمیدەوە :

ئـەم تۆمەتـە هـەموو کـات لـە گـەڵ ناوهێنـانی سـوڵتاندا دووبـارە دەبێتەوە، بەژەهرێکی ئاشکرای سوڵتان عبدالحمید دادەنرێت، کـە لـە کاتی فەرمان ڕەواییەکەیدا ئەو سیخوڕانەی بڵاوکردوەتەوە ! !

بەڵێ زۆبەی نوسەر و مێژوو نوسـەکان بـە نـاڕەوا ئـەم تۆمەتانـەیان داوەتە پاڵ سوڵتان عبدالحمید[١٨] ئیدی بە بێ ئەوەی لـە نیـەت باشـی

---

(١٨) دکتۆر جەلال یەحیا لە کتێبەکەیدا (العالم العربي الحديث – المدخل) دا دەڵێت: سوڵتان عبدالحمید بۆ کۆنترۆڵکردنی ئیمپراتۆریەتە بەرفراوانەکەی پشتی بە سیاسەتی سەرکوت کـردن و بڵاو کردنەوەی سیخوڕ بەستبوو، سوڵتان دەستی کردبـە زیـادکردنی ژمـارەی سـیخوڕەکانی هەروەها بەهێز کردنی دەستەڵاتەکەشیان لە دەستی خۆیاندا بـوو، ئینگلیـز و ئەڵمانـەکان، بـە ناوی گەڕان بە شوێن ئاسەواری مێژووییدا وەفـدیان ڕەوانـەی ناوچـەکانی دەوڵـەتی عوسمـانی دەکرد، بەڵام لـە ڕاسـتیدا ئامانجەکـەیان گـەڕان بـوو بـە شـوێن نەوتـدا !! هـەر لـە سـەرەتاوە سوڵتان عبدالحمید لە مەبەستی هاتنی ئەم وەفدانە ئاگادار بـوو، دڵنیـا بـوو کـە بـۆ گـەڕان بـە شوێن ئاسەواری مێژوویی دا نەهاتوون و مەبەستە سەرەکیەکەیان سیخوڕی و گەڕانە بە شوێن نەوتدا هەروەك دەڵێت (من رازیم ئێوە بە شێوەیەکی ڕون و ئاشکرا بگەڕێن بـە شـوێن نەوتـدا، بەو مەرجەی نهێنی ناو دڵتان لەم کارەدا ئاشکرا بکەن، بەڵام لـەوە دڵنیـا بـن کـە مـن هـەرگیز لێتان قبوڵ ناکەم وەك سیخوڕ لەم وڵاتەدا کار بکەن!).

هەروەها لە یادەوەرییەکانی دا سەبارەت بەم وەفدانە و ئامانجی هاتنیـان بـۆ ئـەم ناوچـانە چەند ڕاستەقینەیەکی خستوەتە ڕوو، هەروەك ئەو وەفدانە سور بـوونی خۆیـان دەردەبـڕن لـە سەر ئەوەی کـە مەبەسـتی هاتنیـان تـەنها بـۆ دۆزینـەوەی ئاسـەواری مێژووییـە، پاشـان ئـەم وەفدانە ڕوویان کردووەتە بەغداد و موصل، بە بیانوی ئەوەی کە بە شوێن ئاسەواردا دەگەڕێن !! لە پاش ماوەیەك هەندێك گۆزە و پارەی کـۆن و ... هتـد یـان نـارد بـۆ سـوڵتان عبدالحمیـد هەروەك شمشێرێکی دێرینیان نارد بۆ سوڵتان عبدالحمید بە نیازی خۆیان تا سوڵتان بگەیەننە

یان لە مەبەستی خراپی سوڵتان وورد ببنەوە، لە ڕوانگەی ئەم دوو ئایەتەوە ئەم تۆمەتەیان خستوەتە پاڵ سوڵتان

(یا ایهاالذین امنوا لا تقربوا الصلاة... ) و (ویل للمصلین.. ) با بپرسین؟ ئایا ئەو هۆکارانە چین کە وای لە سوڵتان کردووە سیخوڕ بڵاوبکاتەوە، ! پاشان ئەو کەسانە کێن کە سیخوڕی بۆ سوڵتان عبدالحمید دەکەن و چاودێری سوڵتانن بە سەر خەڵکەوە؟

ئێمە ئینکاری لەوە ناکەین کە سوڵتان عبدالحمید سیخوڕەکانی بە وڵاتدا بڵاوکردوەتەوە!! بەڵام سوڵتان دەزگایەکی (پۆلیسی نهێنی) دامەزراند بوو، بە مەبەستی چاودێری کردنی ئەو کەسانەی کە گومان لێ کراوو ناپاك و دوژمنی ئوممەتی ئیسلامین لە ماسۆنی و هەروەها بە کرێ گیراوانی دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان!! بەڵام ڕاستەقینەیەك هەیە کە پێویستە ئاماژەی پێی بکەین ئەویش سەبارەت بەو دەزگا پۆلیسیە نهێنیەیە کە سوڵتان بە شێوەیەکی بەربڵاو بە وڵاتدا بڵاوی کردبووەوە، ئەو دەزگایە لە هەموو ناوچەکاندا ڕەگی داکوتا بوو!! ئایا بەڵگەیەك هەیە سەبارەت بە ئازاردران و بەندکردنی خەڵکی بێ تاوان لە بەر ڕۆشنایی ڕێنماییەکانی ئەم دەزگایەدا!! ئایا مێژوو نوسەکان هیچ

---

ئەو بڕوایەی کە بەڵێ ئەم وەفدانە بە شوێن ئاسەواری مێژوویدا دەگەڕێن، بەڵام دواتر دەرکەوت کە سەرجەم ئەوئاسەوارانە بە دەستی خۆیان دروستیان کردوون و بە شێوەیەك ڕازێنرابونەوە، کە چاوت پێیان دەکەوت دەت وت ئەمانە ئاسەواری مێژووین !! پاشان سوڵتان عبدالحمید فەرمانی دەرکرد کە ئەو سیخوڕانە لە وڵات وەدەرنرێن .

جۆرە ستەمکارییەکیان تۆمار کردووە کە لە لایەن ئەم دەزگایەوە ئەنجام درا بێت، بە تایبەت ئەو کات دەوڵەتی ئیسلامی زۆرترین دوژمنی هەبووە لە ماسۆنی وزایۆنی و.. هتد، هەروەها بەردەوام جولەکەکان هەوڵیان داوە بە نهێنی بچنە ناو فەڵەستینەوە و ئامانجەکانیان جێ بە جێ بکەن، ئیدی با نەخشە دۆزەخیەکانی دەوڵەتانی ڕۆژئاواو ناردنی وەفدی گومان لێکراو بۆ ناوچەکانی دەوڵەتی ئیسلامی... یان.... یان.... هتد لەولاوە بوەستێت.

## ئایا نەنگیە بۆ سوڵتان عبدالحمیدو دەوڵەتی ئیسلامی لە وڵاتدا تۆڕی سیخوڕی دروست بکەن؟

بۆچی دەبێت بۆ دەوڵەتی ئیسلامی ڕەوا نەبێت کە لە ژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت و دادگای ئیسلامیدا سزای سیخوڕان بدات، بە تایبەتی لەو سەردەمەدا کە لە ناوچەکانی دەوڵەتی ئیسلامی و تەنانەت لە ناوحکومەتیشدا سیخوڕ و بەکرێ گیراوی ڕوسیای قەیسەری و فەرەنسای تێدا بوو، هەروەها چەندین تۆڕی سیخوڕی (بەریتانیا، ئیتاڵیا، نەمسا، ئەڵمانیا) بە شێوەیەکی زۆر سامناك کەوتبوونە جم و جوڵ و چالاکی، لە ناوچەکانی ژێر دەستەلاتی دەوڵەتی عوسمانیدا تەنانەت لە ناو دام و دەزگاکانی سوپادا زۆرترین

سیخوڕ و بەکرێ گیراوی زایۆنیزم و ماسۆنیەتی تێدا [١٩] بوو، جولەکە لە کاتی پیلان گێڕاندا ئاین و بیروباوەڕی خۆیان دەشاردەوە، هەروەها لە ناو کۆشکەکانیاندا کۆمەڵێك پیاوی خەسێنراو هەبوون، کە ئەمانە ئەرکی سەرەکییان بریتی بوو لە سیخوڕی کردن بۆ دەوڵەتە داگیرکەرەکان، بەڵێ ئەمانە خۆیان خەساندبوو پیاوەتی خۆیان کردبووە قوربانی، تا بتوانن لەو ڕێگەوە سیخوڕی بە سەر سوڵتان عبدالحمیدەوە بکەن، پاشان ئاسانکاری بکەن بۆ هاتنە ناوەوەی سوپاو کەشتی یە سەربازیەکانی داگیرکەران بۆ ناوەوەی دەوڵەتی عوسمانی! تەنانەت بەشێکی زۆریان هەوڵیان دەدا کە لەو ناوچە تایبەتیانەدا نیشتەجێ بن کە دوورن لە دەست تێوەردانی دەوڵەت، بە مەبەستی ئەوەی نەکەونە بەر پشکنینی هێزەکانی پۆلیسی دەوڵەتی ئیسلامی لە پێناو ئەوەدا کە نەخشەکانیان ئاشکرا نەبن کە خۆی لە ڕوخاندنی دەوڵەتی عوسمانیدا دەبینیەوە.

---

(١٩) گۆڤاری ( آفاق العربية ) لە ژمارەی نۆیەمی ساڵی (١٩٧٨) دا بەڵگەنامەیەکی سامناکی بڵاوکردووەتەوە کە تیایدا هاتووە :( .... سوڵتان عبدالحمید سیخوڕەکانی خۆی لە دەوروبەری بارەگاکانی ماسۆنیەکان دا بڵاو دەکردەوە و ناوی هەموو ئەو کەسانەیان تۆمار دەکرد، کە سەردانی ماسۆنیەکانیان دەکرد، بەڵام ماسۆنیەکان بە پێچەوانە دژی ئەو هەڵویستە دەوەستانەوە، بەوەی کە سەرجەمی ئەو هاولاتی و ئەفسەر و و پۆلیسە مەدەنیانەی کە بە نهێنی سەردانیان دەکردن، دەیان کردن بە براو هاوکاری خۆیان و هەولیان دەدا بیانکەنە پیشتوانی خۆیان لە پێناو ڕوخاندنی دەوڵەتی عوسمانیدا .

ئایا نەنگی یە بۆ دەوڵەتی عوسمانی و سوڵتان عبدالحمید کە ڕووبەڕووی هەموو ئەو شەپۆلە سیخوڕیانە بوەستێتەوە کە دەوڵەتیان بەرەو ڕوخان دەبرد!!

هەروەك سوڵتان عبدالحمید دانی بەوەدا ناوە کە متمانەی بە سیخوڕەکانی خۆی نیە، چونکە ئەوانی بەوە تۆمەتبار کردووە کە درۆ دەکەن و شاهێدی درۆ دەدەن لەبەر ئەوەیە کە متمانەی پێ نەکردوون، چونکە ژیانی بەردەوام لە مەترسیدا بووە!! سوڵتان عبدالحمید هیچ کات متمانەی بە ڕاپۆرتی سیخوڕەکانی نەکردووە، تەنیا لە کاتێکدا متمانەی پێ کردوون کە دڵنیا بووە لە ڕاستی زانیاریەکانیان، هەمان کات سوڵتان عبدالحمید دەڵێت: (من لە ژیانمدا هەمیشە خۆم بە قەرزاری پیاوە دڵسۆزەکانی دەوڵەت دەزانم... بەردەوام هەوڵی کوشتنی من دراوە... مایەی سەرسوڕمان نیە ئەگەر لە مەو دوا، سەبارەت بە ژیانی خۆم ئەحتیات بکەم، چاك بزانن زۆربەی خەڵکی دەیانەوێت حاڵەتی عەسەبیەتی من بە کار بهێنن بۆ بەرژەوەندی خۆیان، هەروەکو ڕێز و سوپاسی خۆم دەردەبڕم سەبارەت بەو لێکۆڵەرانەی وەکو خۆی زانیاری یەکان دەگەیەنن، چونکە ئاینەکەمان نەفرینی لەو کەسانە کردووە کە شاهێدی درۆ دەدەن، لە هەمان کاتدا ئەگەر من ئەم دەزگا سیخوڕیە گەورەیەم نەبوایە شتێکی قورس بوو کە بتوانم پارێزگاری لە سەلامەتی خۆم و

مانەوەی دەوڵەتی ئیسلامی بکەم، بە تایبەتی مەترسیەکان لە هەموو لایەکەوە ڕووبەڕووم بوونەتەوە.

ئایا پاشاو فەرمانڕەواکانی پێش ئێمە وەکو ئێمە پارێزگاری یان نەکردووە لە سەلامەتی گیانی خۆیان؟ هەروەها دەڵێت : لای هەموان ڕوون و ئاشکرایە کە چەندین جار هەوڵی کوشتنی من دراوە ئیدی بۆچی دووچاری سەرسوڕمان دەبن، ئەگەر من خۆم لە هەموو کەسێك بەدوور بگرم، تەنانەت لە نزیکترین کەسیش خۆم بە دوور دەگرم، ئەمەش لە پێناو ئەوەدا دەکەم پارێزگاری لە ژیانی خۆم بکەم؟ کە ئەمەش شتێکی سادەیە و سروشتی مرۆڤ بەو شێوازەیە، ئەمە هەستێکە و پێویستە لێی تێ بگەین.

خەڵکی پرسیار دەکەن ودەڵێن : گۆشەگیری من بووەتە هۆکاری دابڕینم لە وڵات بە شێوەیەك کە بێ ئاگابم سەبارەت بەو ڕوداوانەی کە لە ناوخۆی وڵاتدا ڕوودەدەن! ! ئەمە لە کاتێکدایە کە دەزگا سیخوڕەکانی من ئەوەندە تۆکمە و توندوتۆڵ بوون، کەس توانای ئەوەی نەبووە کە ڕووداوەکانم لێ بشارێتەوە.

**بۆچوونەکان سەبارەت بە سوڵتان عبدالحمید:**

هەرورەك دەزانین زۆرێك باسی سوڵتان عبدالحمیدیان بە چاکە کردووە، وەك لە پێشەوە ئاماژەمان پێدا، بە هەمان شێوە زۆر کەسیش تۆمەت و بوختان و درۆی نابەجێ بۆ سوڵتان عبدالحمید دروست دەکەن، شتێکی ڕوون و ئاشکرایە ئەم تۆمەتانەش لە لایەن

داگیرکەر و زایۆنیزم و ماسۆنیەکانی دوژمنانی ئیسلامەوە خراونەتە پاڵ سوڵتان عبدالحمید، لە پێناو ناشیرین کردنی کەسایەتی سوڵتان عبدالحمیددا !! لە لایەکی ترەوە ئەم تۆمەتانەش ڕێگر نەبوون لەوەی کە سوڵتان بە سیفەتەجوانەکانی ناو ببرێت، کە ئەمەش راستەقینەیەکی مێژووییە، کەس ناتوانێت نکوڵی لەوە بکات کە سوڵتان کەسایەتیەکی ڕەوشت بەرز و کار و کردەوە جوان بووە، کە بەردەوام لە هەوڵداندا بووە بۆ گەشەپێدانی دەوڵەت و ڕزگارکردنی گەلە موسوڵمانەکەی لە تەنگ و چەڵەمە و ناڕەحەتیەکان....

هەروەك مستەفا کامیل لە کتێبەکەیدا (المسألة الشرقية) لە لاپەڕەی دەیەمدا دەڵێت :(.. گەورەترین سوڵتانی (ئالی عوسمان) کە چوبێتە سەر کورسی فەرمان ڕەوایی و لە هەوڵ و کۆششی بەردەوام دا بووبێت، بۆ ڕووبەڕووبونەوەی دەست تێوەردانی دەرەکی و پاك کردنەوەی دەوڵەت لەو جۆرە کەسانە، سوڵتان عبدالحمید بووەو، ناوبراو لە جەنگی (١٨٧٧) ەوە ئەو وانەیە فێربوو، هەموو ئەو کێشانەی کە ڕووبەڕویان دەبوویەوە لە دەوڵەتدا بەشێك بوون لە چەرمەسەریەکان، بەڵێ سوڵتان بە حیکمەتە فراوانەکەی خۆی ئەو مەترسیانەی ڕەواندەوە و بەردەوام هاندەری پیاوانی دەوڵەت بوو، هانی ئەو کەسانەی دەدا کە لە ناو دەوڵەتدان، تا هەوڵ بدەن بۆ زیاتر بەرزکردنەوەی ئاست و تواناکانی دەوڵەت).

هەروەها جمال الدینی ئەفغانی دەڵێت (ئەگەر سوڵتان عبدالحمید بەراورد بکەیت بە چوار فەرمان ڕەوای سەردەمی خۆی، ئەوا بێگومان لە ڕووی دانایی و زیرەکی و سیاسەتەوە، لە هەموویان بەتواناتر و لە پێشترە).

هەروەها تەها مەدور دەڵێت (لە ناو سوڵتانەکانی بنەماڵەی عوسمانی دا (ئالی عوسمان) سوڵتان عبدالحمید ژیرترین و زیرەکترین و بیرتیژترین سوڵتانی عوسمانی بووە. )

ئەرنۆڵد توینبی لە کتێبەکەیدا (العالم والمغرب) لە لاپەڕە (٢٧) دا دەڵێت (سوڵتان عبدالحمید کەسێکی زرنگ و وریا بوو، بەڵام پێویست بوو خۆی یەکلایی بکاتەوە بۆ جەنگ کردن لە گەڵ دوژمنانی دەرەوەی ئیمپراتۆریەتەکەیدا، کە مەبەستمان دەوڵەتە داگیرکەرەکانن بەڵام سوڵتان خۆی خەریك کرد بە دوژمنە لاوەیەکیەکانی ناوخۆی خۆیەوە، هەڵەیەکی تری ئەوەبوو کە ناوبراو نەیتوانی گەشە بە توانا سەربازییەکانی (قوتابخانەی سەربازی) تورکی بدات بە سوود وەرگرتن لە پێشکەوتنەکانی ڕۆژئاوا لە بواری سەربازی دا).

هەروەها جۆرج ئەنتۆنیۆس دەڵێت (سوڵتان عبدالحمید زۆر بە باشی لەوە تێگەیشتبوو کە مانەوە و بەهێز بوون و سەلامەتی تورکیا بەندە بەکێ بەرکێی نێوان دەوڵەتە گەورەکان، دوژمنایەتی کردن و ململانێی ئەودەوڵەتە داگیرکەرانە لە ناوخۆیاندا لە بەرژەوەندی دەوڵەتی عوسمانیدایە.)

هەروەها مێژوونوس (عبدالله الیل) دەڵێت (... بە هەر حاڵ ئەوەی کە باسکرا سەبارەت بە یەکسانی سەردەمی سوڵتان عبدالحمید، ئەوەندە بەسە بۆ سوڵتان کە شانازی پێوە بکات و دەرکەوت ئەو هێزانەی گەلەکۆمەیان کرد بۆ ڕووخاندنی دەوڵەتەکەی، ئەوانە بوون کە دوژمنی سەرسەختی ئیسلام بوون! بە هەمان شێوە ئەوەندە بەسە بۆ سوڵتان عبدالحمید شانازی پێوە بکات، کە ئەو بەدرێژایی ماوەی فەرمان ڕەوایی خۆی، بە ووردی چاودێری ئەو ئیمپراتۆریە ئیسلامیەی کرد و پاراستی، نەخشەی پەرت کردنی ناوچەکانی دەوڵەتی ئیسلامی کاتێك دەستی پێکرد کە جولەکە و ماسۆنیەکان دەستیان گرت بە سەر ناوچە گرنگەکاندا).

سبحانك اللهم ربنا وبحمدك اشهد ان لااله الا انت استغفرك واتوب اليك

وصلى الله على سيدنا محمد وعلى اله وصحبه الاخيار

بەپشتیوانی خوای گەورە لە ڕۆژی ٢٠٠٩/٥/٢٥دەستم کرد بە وەرگێڕانی ئەم کتێبەو،سوپاس بۆ پەروەردگار لە ٢٠٠٩/٦/٣٠ دا کۆتایی بە وەرگێڕانەکەم هات

ناونیشانی وەرگێر

Karwanrasheed@yahoo.com

ژمارەی مۆبایل : ٠٧٥٠١١١٦٣١٨

# ناوەڕۆك